سەردەمی گوڵین - ٦

# حەزرەتی

# خەدیجە

## ڕەزای خوای لێبێت

موحەممەد بویوکشاهین





IRFAN PUBLISHING

سەردەمی گوڵین -٦-

حەزرەتی

# خەدیجە

ڕەزای خوای لێبێت

موحەمەد بویوکشاهین

سەردەمی گوڵین
٦

# حەزرەتی خەدیجە
## ڕەزای خوای لیبێت

نووسینی: موحەمەد بویوکشاهین
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: مارت - ٢٠١٥
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٤٨)ی
ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە
تیراژ: ٣٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

ناوەڕۆک

# مزگێنیەکەی یوسف

لەشوێنێکی چۆڵ و بێدەنگدا و لەناو سەوزایی و کۆمەڵە دارخورمایەکدا کە ناتوانن میوە قورسەکانیان هەڵبگرن... لەم باخچەیەدا دووکەس پیاسە دەکەن... یەکێك لەوانە حەزرەتی یوسفی پێغەمبەرمانە (سەلامی خوای لێبێت) ئەوی تریان خوەیلیدی باوکی خۆشەویستی دایکی ئیمانداران خاتوو خەدیجەیە (ڕەزای خوای لێبێت)... یوسف پێغەمبەر خورما کۆدەکاتەوە و دەیخاتە کۆشی خوەیلیدەوە، بەڵام کۆشی خوەیلید هەر پڕنابێت.

یوسف پێغەمبەر لەکۆتاییدا خورمایەکی گەورەی لە لقەکەی لێکردەوە و بەدەستی خۆی خستیە دەمی خوەیلیدەوە. ڕێك لەم کاتەدا خوەیلید گوێی لەدەنگێك بوو:

- خوەیلید، دە ئیتر لەخەو هەستە!

کەچاوی کردەوە تێگەیشت کە خەون بوو. بانگی فاتیمەی کردو وتی:

- فاتیمە! وەرە بۆلام... بزانە چیت بۆ باس دەکەم.

کە فاتیمە هاتە لای، چاوەکانی خوەیلید وەکو ڕۆژ دەدرەوشانەوە. دیاربوو کە زۆر دڵخۆش بوو. فاتیمەش بەزەردەخەنەیەکەوە وتی:

- پێم بڵێ، چی ڕوویداوە؟ هۆکاری ئەم دڵخۆشییەت چیە؟

- کوڕێکمان دەبێت، ڕۆزی و بەرەکەت دەهێنێتەماڵەکەمان. ناوی لەهەموو شوێنێك دەبیسترێت، ناوی دەنێم یوسف. بۆئەوەی خووڕەوشت و جوانی لەیوسف پێغەمبەر بچێت.

فاتیمە بەبێدەنگی گوێی لەهاوسەرە خۆشەویستەکەی دەگرت.

کاتێك خوەیلید خەونەکەی دەگێڕایەوە تەماشای چاوەکانی هاوسەرەکەی دەکرد. سەرسام بوو بەگرنگی پێنەدانی فاتیمە، بۆیە وتی:

- ئەی فاتیمە! دەڵێی پێت خۆش نەبوو.

فاتیمە دڵی زۆر ناسك بوو، نەیدەویست کەس خەمبار بێت، بۆیە وتی:

- گیانەکەم زۆر حەزدەکەم قسەکانت ڕاست دەربچێت، بەڵام خورما ئەگەر لەخەوندا ببینرێت نیشانەی کچە. بەڕای من کچێکمان دەبێت.

خوەیلید پەرێشان بوو. بەچاوێکی پڕ سۆز و بەزەییەوە تەماشایەکی فاتیمەی کرد و وتی:

- ئەگەر وابێت باوکم چیم پێدەڵێت؟ چۆن بچمە ناو خەڵکی؟

فاتیمە دڵی تەنگ بوو چاوی پڕبوو لەفرمێسك و وتی:
- خۆ هەموو خەونێك ڕاست نیە.. پێویستە خۆمان بۆ کوڕیش و بۆ کچیش ئامادە بکەین.

خوەیلید لەلای فاتیمە هەستا و دەستی کرد بە سوورانەوە بەناو ژوورەکەدا. لەپەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد و دڵپسان گەڕایەوە لای هاوسەرەکەی. هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی:

- ئایا دەتەوێت کچەکەمان بەزیندوویی بخەیتە ژێر خاکەوە؟!!

فاتیمە وتی:

- ئەمە واتای چیە خوەیلید؟ کچ بێت یان کوڕ بێت وەك گیانی خۆم دەیپارێزم.

خوەیلید کەسێکی دڵپاك و ڕەوشت جوان بوو. بەو دواکەوتوویيەی ئەو سەردەمە زۆر ناڕەحەت بوو.

- منیش وەك تۆ بیردەکەمەوە. بەڵام ئەی دابونەریت و چاولێکەریەکان؟

فاتیمە نەیدەزانی چۆن وەڵامی مێردەکەی بداتەوە. سەری وەك پوورەی هەنگ هاژە هاژی دەکرد و بیروبۆچونی زۆر جیاواز بەمێشکیدا دەهات. لەکاتێکدا فرمێسکەکانی بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە لە مێردەکەی پرسی:

- ئەی تۆش لە ژنێك لەدایك نەبوویت؟

خوەیلید سەیری دەموچاوی فاتیمەی خێزانی کرد و وتی:

- ڕاستە، بەڵام دەمەوێت یەکەم منداڵم کوڕ بێت.

فاتیمە زۆر باش یاساکانی بیابانی دەزانی، وتی:

- دڵتەنگ مەبە خوەیلید. ئەو منداڵەی دەمانبێت زۆر پێ بەخێرە.

خوەیلید هەستی جوڵا، یادەوەرییە تاڵەکان هاتنەوە بەمێشکیدا. بیری لەو منداڵە بچووکانە دەکردەوە کە چۆن بەزیندوویی سپاردەی خاك دەکران. سەری داخست و وتی:

- کەس ویژدانی نەماوە و مرۆڤەکان تابڵێی نەزانن. باوکم چاوەڕێی کوڕێکە لێم کە لەڕێیەوە بەردەوامیی بە ڕەچەڵەکی خێزانەکەی بدات. ئەو نایەوێت خەڵك بڵێن: "نەوەکەی ئەسەد کچ دەرچوو."

فاتیمە وتی:

- من لەناخمدا هەستێکم هەیە کە کچمان دەبێت و دڵەکانیش نەرم دەبن. چونکە ئەو کچە مزگێنیی حەزرەتی یوسفە بۆ ئێمە.

خوەیلید بەکۆتا قسەکانی خێزانەکەی دڵخۆش بوو. تەماشایەکی فاتیمەی کرد و زەردەخەنەیەك لەسەر لێوانی دەرکەوت.

* * *

# با ناوی خەدیجە بێت

زۆر بەسەر ڕووداوی خەونەکەدا تێنەپەڕی کە فاتیمە نەخۆش کەوت. بەگوێرەی ژماردنی خۆیان هێشتا کاتی لەدایك بوونی منداڵەکەیان نەهاتبوو. دەستپێکردنی ئەم ژانە زووە خێزانەکەی ترساندبوو. تۆبڵێی منداڵەکەیان بەمردوویی لەدایك بێت؟

خوەیلید یەکسەر هەواڵی گەیاندە خزمە نزیکەکانی. لەماوەیەکی کەمدا مامی و خوشك و براکانی و باوکی و دراوسێکانی لە ماڵەکەی کۆبوونەوە. وەرەقەی برازای خوەیلیدیش لەگەڵ خوشکەکەیدا هاتبوو. هەمووان دڵ پڕ جۆش و خرۆش بوون.

خێرا دەستیان کرد بەئامادەکاریەکان. بڕیاربوو ئەگەر ئەو منداڵەی لەدایك دەبوو، کوڕ بێت، ئەوا بۆنەیەکی زۆر شکۆمەندیان بۆ ڕێك دەخست.

خوەیلید هەروەك ئەوەی زمانی لەدەمدا نەبێت لەگەڵ کەس قسەی نەدەکرد.

کاتی ئێوارە نزیك بووەوە. تا درەنگتر دەبوو، نارەحەتی خەڵکەکە رووی لەزیادبوون دەکرد. چاوەکان تەماشای ئەو دەرگایەیان دەکرد کە فاتیمەی لێبوو، بەئومێدی ئەوەی بە هەواڵێکی خۆشەوە بکرێتەوە. لەکۆتاییدا ئەو ساتە هات کە هەمووان چاوەڕێی بوون. لەگەڵ هاتنە دەرەوەی مامانەکە، لەدەرەوە جموجوڵێك پەیدا بوو. ژنەکە نزیکی خوەیلیدی باوکی ئەسەد بووەوە و بەشەرمەزاری و بێزارییەکەوە وتی:

- کچێکی لەشساغتان بوو. تەندروستی فاتیمەش باشە.

خوەیلید وەك هەموو کەس گوێی لەم هەواڵە بوو، بەڵام دڵخۆش نەبوو. چونکە چاوەڕێی کوڕێکی دەکرد. هەروەك ئەوەی تاوانێکی زۆر گەورەی ئەنجام دابێت ڕەنگی سور هەڵگەڕابوو. ئەوەندەی نەمابوو بگری. بەرەو پشتەوەی ماڵ ڕۆیشت.

پاڵی بەدیوارێکەوە دایەوە و دەستی کرد بە تەماشاکردنی حوشترەکانی کە لەباخەکەدا دەلەوەڕین. پاش کەمێك بەدەنگی ئەو کۆیلەیە ڕاچڵەکی کە بەرەو لای دەهات. کۆیلەکە بانگی ئەمی دەکرد. بەپێی دابونەریتەکانیان دەبوو بچێتە لای دایکی منداڵە تازە لەدایکبووەکە.

وەرەقە و ئەسەد و خوەیلید پێکەوە چوون بۆلای فاتیمە. فاتیمە لەجێگەدا بوو. منداڵەکەی لەباوەش گرتبوو و بەو شێوەیە پاڵکەوتبوو. ئەسەد منداڵەکەی بینی تورەییەکەی دەموچاوی گۆڕا بۆ خەندەیەکی شیرین. دڵی بەشێوەیەك نەرم



بوو کە ناتوانرێت باس بکرێت. هەروەك ئەوەی مژدەیەك بدات بە میوانەکان هاتە دەرەوە و وتی:

-کچێکمان بووە. بەئومێدی ئەوەی ئەو کچە خۆشی بهێنێتە ماڵەکەمان و بەرەکەت بخاتە سەر خوانەکانمان، فەرموون دانیشن بۆ نان خواردن.

سەرسامی هەمووانی داگرت. هەندێکیان شێوەی دەموچاویان گۆڕاو مۆنیان کرد. چاوەڕێی وەڵامێکی وایان لە ئەسەد

نەدەکرد. خوەیلید بوو لەناو قەرەباڵغیەکەدا ئەوەی لە هەمووان زیاتر دڵخۆش بوو.

خوەیلید تەنها بۆئەوەی دڵی باوکی خۆش بکات منداڵی کوڕی دەویست. لەپاش بینینی خەونەکە هەستی کردبوو کە منداڵێکی کچی دەبێت. کە بینی باوکی خۆشحاڵە ئیتر ڕوخساری خوەیلیدیش خۆشحاڵی تێکەوت و یەکسەر دەستی باوکی ماچ کرد. وەرەقەی کوڕی نەوفەل لەبەردەم ئەم دیمەنەدا خۆی پێڕانەگیرا و بەرەو ناوەڕاستی خەڵکەکە ڕۆیشت و ماوەیەك ڕاوەستا. وەك ئەوەی شتێك هاتبێت بە مێشکیدا داوای کرد منداڵە بچووکەکەی بۆ بێنن. داواکاریەکەی وەرەقە زوو جێبەجێ کرا. منداڵەکەیان هێناو خستیانە باوەشیەوە. پاش ئەوەی کە منداڵە ساواکەی هەڵگرت، زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:

- با ئەمە ناوی خەدیجە بێت. چونکە پێش کاتی خۆی لەدایك بووە و هەروەها ڕەنگیشی زۆر سپیە.

پاشان وەرەقە وتارێکی بچووکی دا و هیواشی خواست ئەم ناوە ببێتە هۆی هەموو شتێکی باش.

* * *

# میوانە بەڕێزەکە

پاش مەراسیمی ناونانەکە، ئەسەد و وەرەقە و چەند ژنێك لەماڵی خوەیلیددا مانەوە. یەکێك لە ژنەکان هەواڵی هاتنی عەبدولموتەڵیبی دا. لەسەر ئەم هەواڵە هەموویان چوونە دەرەوە بۆ پێشوازی کردنی. عەبدولموتەڵیب لەدەرگای حەوشەوە زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرا.

عەبدولموتەڵیب سەرۆکی هۆزی قورەیش و دۆزەرەوەی بیری زەمزەم و مرۆڤێکی بەڕێز و خۆشەویست بوو. هەندێك لە حەوشەکەدا مایەوە و سەرنجێکی دەوروبەری دا. شەربەتیان پێشکەش کرد و باسی خەدیجەیان بۆ کرد. وەرەقەش نزیکیان بووەوە و پاش کەمێك خوەیلیدیش بەشداری قسەکانیانی کرد. عەبدولموتەڵیب وتی:

- بۆیەکەم جارە کە دەبینم پاش لەدایك بوونی کچێك، سیماکان پێدەکەنن. ناخی منیش زۆر ئاسودەیە.

ئەسەد سەری بەرز کردەوە و تەماشایەکی ئاسمانی کرد. کەشوهەوا زۆر خۆش بوو. وەك ئەوەی هەموو ئەستێرەکان لەدەوری مانگی چواردە کۆبووبێتنەوە. خوەیلید بەزەردەخەنەیەکەوە دەستی کرد بە قسەکردن:

- گەورەم، منیش وامدەزانی ئەگەر کچ بێت شێت دەبم. بەڵام وا نەبوو.

عەبدولموتەڵیب هەواڵی خەدیجەی پرسی و وتی:

- دەمەوێت ئەو منداڵە ببینم.

هەموویان پێکەوە چوونە ژوورەوە. خەدیجە لەناو بێشکەکەیدا نوستبوو. ئەو مۆمانەی لای سەریەوە دانرابوون جوانییەکی تریان پێدەبەخشی.

عەبدولموتەڵیب منداڵە بچووکەکەی هەڵگرت و بە هەردوو دەستی بەرزی کردەوە. خەدیجە هێندەی چۆلەکەیەك سوك و هاوشێوەی هەوریش نەرم و شل بوو.

عەبدولموتەڵیب سەری سوڕما. لەژیانیدا منداڵی کچی ئەوەندە جوانی نەبینیبوو. ئەو پارەیەی کەوەك دیاری ئامادەی کردبوو پێی کەم بوو. دەستی برد بۆ گیرفانی و ئەوەندەی لەگیرفانی مابووەوە دەری هێنا و بەبێ ژماردن لە ژێر بێشکەی منداڵەکەدا داینا.

ئەوانەی لەوێ بوون سەرسامی بە سیمایانەوە دەبینرا. چونکە دیاری گەورەی بەم شێوەیە تەنها بەمنداڵە کوڕەکان دەدرا. خوەیلید نزیکی خەدیجە بووەوە و بە خۆشەویستیەکی بێسنوورەوە کچە شیرینەکەی لەباوەش گرت.

عەبدولموتەلیب پاش ئەوەی دیاریەکەی خەدیجەی دانا، مۆڵەتی وەرگرت و لەماڵەکە دەرچوو. هاتنی ئەم پیاوە خانەدانە، ئەندامانی ماڵەکەی دڵخۆش کرد و بوو بەسەرچاوەی سەربەرزی بۆ خوەیلید و خێزانەکەی. بەپێی دابونەریتی ئەو کاتە، سەردانی هاوشێوەی ئەمە تەنها لەکاتێکدا دەکرا کە منداڵەکە کوڕ بووایە.

لەگەڵ لەدایك بوونی خەدیجەدا هەندێك لە دابونەریتەکانیش گۆڕان. خوەیلید و فاتیمەش زۆر بەمە دڵخۆش بوون. خەدیجەی بچووك وا بووە خۆشیی ماڵ و شادیی دڵیان.

بە پێی دابونەریتی ئەو کاتە پاش ماوەیەك لە لەدایکبوونی منداڵ دەدرا بە دایەن تا شیری بداتێ و بەخێوی بکات. ئەوەبوو خەدیجەش لەتەمەنی سێ مانگیدا بۆماوەیەکی دیاریکراو لە دایك و باوکی دوور کەوتەوە و برا بۆ لای دایەنەکەی.

* * *



# منداڵەکان

ڕۆژەکان تێدەپەڕین و خەدیجەش تادەهات گەورەتر دەبوو. دایك و باوکی ئەوەی لە توانایاندا بوو دەیانکرد بۆ ئەوەی خەدیجە بە باشترین شێوە پەروەردە ببێت. بۆیە خوەیلید دەیویست کچەکەی لەلای وەرەقەوە بخوێنێت. ئەم بیروڕایەی لای هاوسەکەی باس کرد.

فاتیمە ئەم بیرۆکەیەی قبووڵ کرد و هەردووکیان پێکەوە

چوون بۆلای وەرەقە و ئەم بابەتەیان لەگەڵ کردەوە. وەرەقە بەبێ بیرکردنەوە داواکاریەکەیانی پەسەند کرد. ئیتر مامۆستاکەی خەدیجە "وەرەقە"، یەکسەر دەستی کرد بەوانەکان. خەدیجە زۆر بە ئاسانی فێری خوێندنەوە و نووسین بوو. وەرەقەش شەیدای زیرەکی و کۆششەکانی بوو.

لەو سەردەمەدا لە عەرەبستان منداڵە کچەکان بە نەخوێندەواری دەمانەوە و وەك کۆیلە کاریان پێدەکرا. تەنانەت لەناو کوڕەکانیشدا زۆر کەم کەس هەبوون کە خوێندنەوە و نووسین بزانن. خوێندنەوە و نووسین جیاکەرەوەیەکی زۆر گەورەبوو بۆ خەدیجە لەمنداڵەکانی تر.

خەدیجە بێجگە لە خوێندنەوە و نووسین زانیاری جۆراوجۆر لە وەرەقەوە فێربوو. لەماوەیەکی کەمدا ئاکارە بەرزەکانی و جوانییەکەی سەرنجی هەموو کەسی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. جارێ هێشتا منداڵ بوو کە زۆر کەس دەهاتن بۆ خوازبێنی، بەڵام ئەو ڕازی نەدەبوو.

کە تەمەنی گەیشتە پازدە ساڵی، کچێکی ژیر و ڕێکوپێکی لێدەرچوو. هەمووان باسی خانەدانی و پاکیی ئەویان دەکرد. ئیتر دایك و باوکی بیریان لەوە کردەوە کە ئیتر کاتی شووکردنی هاتووە. دەستیان کرد بەوردبونەوە لە خوازبێنیکەران. کۆتا خوازبێنیکار ئەبوهالە بوو، مرۆڤێکی وا بوو کەس نەیدەویست لەدەستی خۆی بدات. کەسێکی خۆشەویست و ڕێزداربوو لای هەمووان.

دایکی بە خەدیجەی وت:

- کچم، ئەبوهالە هاتووە بۆ خوازبێنیت.

خەدیجە سەری داخست. ئەبو هالە کوڕی یەکێك لەخانەوادە ناودار و دەوڵەمەندەکانی مەککە بوو. گەنجێکی ڕاستگۆ و بەئابڕوو و تێکۆشەر بوو.

سەری بەرز کردەوە و لەدایکی پرسی:

- باوکم ڕای چۆنە؟

فاتیمە وەڵامی دایەوە:

- باوکت دڵی پێوەیە.

پاش بێدەنگییەکی کەم، خەدیجە دەستی کرد بەقسەکردن:

- ئێوە چی دەڵێن با وا بێت، بەڵام پێش ئەوەی پرسیار لە وەرەقەی کوڕی مامم بکەم نامەوێت بڕیار بدەم.

فاتیمە زۆر ئاسودە بوو. زەردەخەنە کەوتە سەر ڕوخساری و وتی:

- کچم زۆر ڕاست بیردەکەیتەوە. ئێمەش بەنیاز بووین، تا قسە لەگەڵ وەرەقە نەکەین پەیمان نەدەین بە ئەبوهالە.

خەدیجە وتی:

- باشە، ئێستا دەتوانم بڕۆم و لێی بپرسم؟

دایکی مۆڵەتی پێدا و ئەویش یەکسەر بەرەو لای وەرەقە ڕۆشت.

وەرەقە وتی:

- ئەی خەدیجە وادیارە کێشەیەکت هەیە. چیتە؟

خەدیجە وتی:

- ئەی کوڕە مامم! ئەبوهالە هاتووە بۆ داخوازیم و دایك و باوکیشم بەدڵیانە. مۆڵەت دەدەیت شوی پێبکەم؟

وەرەقە بە ڕەفتارێکی باوکانەوە وتی:

- لەڕاستیدا ئەو مرۆڤێکی باشە. دەوڵەمەند و ڕاستگۆ و ئازایە. ئەگەر دایك و باوکت ڕازین تۆش ڕازی ببە.

خەدیجە وەڵامی نەدایەوە.

وەرەقە تەماشایەکی خەدیجەی کرد. پاشان وەك ئەوەی فەرمانی پێبکات وتی:

- تۆ شوی پێبکە! منیش لە یەکدیتان مارە دەکەم.

خەدیجە لەتەمەنی پازدەساڵیدا شوی کرد بە ئەبوهالە. ئەم هاوسەرگیرییە زۆری نەخایاند. مێردەکەی کۆچی دوایی کرد و لەدوای خۆی دوو منداڵ و سەروەت و سامانێکی زۆری بەجێهێشت. پاش مردنی مێردەکەی خەدیجە بڕیاریدا خۆی بە بازرگانیەوە خەریك بکات. کاروانی ئامادە دەکرد و بۆشارە نزیکەکانی دەنارد. بەمە پارەیەکی باشی دەستکەوت و تا دەهات سامانەکەی زیادی دەکرد. تا وای لێهات بوو بە یەکێك لە ژنە دیارەکانی مەککە.



بەتوانایی و زیرەکی و ڕووخۆشی و ڕاستگۆیی خەدیجە لەلایەن هەمووانەوە هەستی پێدەکرا. بەڕادەیەك بازرگانە بە ئەزموونەکانی مەککە ئیرەییان پێدەبرد.

زۆری پێنەچوو دەستکرایەوە بە خوازبێنی کردنی. خەدیجەش بە "نەخێر" وەڵامی هەمووانی دەدایەوە. بەڵام بیرێکی لە ئازایی و ڕاستگۆیی و دەوڵەمەندیی و تێکۆشانی عاتیك کردەوە کە یەکێك بوو لە خوازبێنیکەرەکان. ڕاوبۆچوونی گەورەکانی وەرگرت. هەموویان هاوسەرگیریی ئەویان لەگەڵ عاتیك بە بڕیارێکی ڕاست دادەنا.

خەدیجە لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا دووەم هاوسەرگیری ئەنجام دا. لەم هاوسەرگیریەشدا منداڵێکی کچی بوو. ماوەیەکی کەم پاش لەدایکبوونی منداڵەکەی، عاتیکی مێردی لەگەڵ کاروانەکەیاندا بەرەو جێگایەکی دوور بەڕێکەوت، بەڵام لەبری گەڕانەوەی خۆی، هەواڵی مردنی گەشت. خاتوو خەدیجە ئەم جارەش بێوەژن کەوتەوە. چیتر بیری لەشووکردن نەکردەوە. بەڵام هەر بەردەوام بوو لەسەر بازرگانی کردن.

* * *

# سپێدەی مەککە نزیکە

دەوڵەمەندەکانی نیوە دورگەی عەرەب ژیانێکی پڕ سەروەت و سامانیان هەبوو، کەچی هەژارەکان نان نەبوو بیخۆن. خەدیجەی دایکی ئیماندارانیش لە ڕیزی دەوڵەمەندەکاندا بوو، بەڵام ژیانێکی سادەی بەسەر دەبرد. کارەکانی ماڵ خۆی دەیکرد و هەر خۆی منداڵەکانی بەخێو دەکرد.

بەشێکی زۆر لەو قازانجەی کە لە ڕێگەی بازرگانیەوە دەستی دەکەوت، جیای دەکردەوە بۆ کەمدەرامەت و منداڵان. کاتێك کاروانەکەی دەگەیشتە مەککە، منداڵە بێباوك و مرۆڤە هەژارەکان چواردەوری کاروانەکەیان دەدا. خاتوو خەدیجە بووبوو بە ئومێدی هەژاران و سەرپەرشتیاری بێ باوکان.

کاتێك تەمەنی گەیشتە سی و چوار ساڵی، لە ماوەی چەند مانگێکدا باوکی لەدەستدا. زۆری پێنەچوو دایکیشی نەخۆش کەوت و مرد.



بێ دایك و باوكی زۆر كاری لە حەزرەتی خەدیجە كرد.كەم كەس هەبوو بتوانێت نهێنی لا بدركێنێت و خەم و خەفەتەكانی خۆی لا باس بكات. ئێستا وا دووان لەوانەش مردن. ئەگەر وەرەقە نەبووایە ئەوا بەتەواوی بەتەنها دەمایەوە. وەرەقە تەمەنی نزیكەی هەشتا ساڵ بوو، چاوەكانیشی لە دەست دابوو.

ئەو كاتانەی هەستی بە بێكەسی بكردایە، سەردانی وەرەقەی دەكرد. وەرەقەش هەواڵی ئەوەی پێدا كە كاتی هاتنی ئەو كۆتا پێغەمبەرەی كە لە كتێبە پیرۆزەكاندا ئاماژەی پێكراوە هاتووە.

پێغەمبەری مزگێنی پێدراو هەر تەنها ئەوە نەبوو کە مێشکی خەدیجەی پێوە سەرگەرم بێت، بەڵکو خەونیشی پێوە دەبینی.

خاتوو خەدیجە شەوێك خەونێکی بینی. بەڵام ئەم خەونە لەوانی تر جیاواز بوو. ئەستێرەیەك لە ئاسمانەوە کەوتە خوارەوە و چووە ناو سنگی خاتوو خەدیجە و لە قۆڵەکانیەوە هاتە دەرەوە. لەگەڵ بەرزبوونەوەشیدا بۆ ئاسمان، هەموو لایەکی نوقمی ڕووناکی کرد. کە بەخەبەر هات و زانی خەونی بینیوە، کەمێك خەمبار بوو و لەبەر خۆیەوە وتی:

- ئەم شتە خۆشانە تەنها لەخەوندا دەبینرێن.

لە جێگاکەی هەستا و هەروەك ئەوەی بفڕێت بەرەو پەنجەرەکە ڕۆشت و پەنجەرەکەی بە تەواوی کردەوە. شنەبایەکی فێنك هەڵی کرد. سەیرێکی ئاسمانی کرد. هەوا زۆر پاك بوو. ئەستێرەکانیش دەبریسکانەوە. لە ئاسماندا بەدوای ئەو ئەستێرەیەدا دەگەڕا کە لە خەونەکەیدا بینیبووی. کە بینی ئەستێرەکان هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ یەکتریدا نییە، لەبەرخۆیەوە وتی:

- هەرچۆنێك بێت خۆ بەرەبەیان نزیکە! خەوەکەم بۆ وەرەقەی ئامۆزام باس دەکەم و ئەویش بۆم لێکدەداتەوە.

هەر کە خۆر هەڵهات خۆی ئامادەکرد و کەوتە ڕێ. زۆر بەخێرایی خۆی گەیاندە ماڵی وەرەقە. وەرەقە کە هەستی بە جۆش و خرۆشەکەی کرد پرسی:

- خێرە کچم؟ ئەوە چیتە؟

خاتوو خەدیجە هەموو ئەوانەی کە بینیبووی وەك خۆی بۆی

گێڕایەوە. وەرەقە خەریك بوو لاڵ ببێت. لێدانی دڵی زیادی کرد. چاوی پڕ بوو لە ئاو. بەدەنگێکی لەسەرخۆ وتی:

- مژدەت لێبێت ئەی خەدیجە! مژدەت لێبێت... ئەم خەونە بەخششێکی زۆر ڕوونە بۆ تۆ. ماڵەکەت پڕ دەبێت لە نوور. ڕاستیەکەی تەنها خوا دەیزانێت، بەڵام ئەم نوورە نووری پێغەمبەرایەتیە.

خەدیجە چاوەکانی دەدرەوشانەوە. لەبەرامبەر ئەم شتانەدا کە بیستی، لە جێگەی خۆی سڕبوو. وەك ئەوەی بپرسێت "جا ئەم خەونە پەیوەندی چیە بە منەوە؟" تەماشایەکی وەرەقەی کرد.

وەرەقە دەستی کرد بە باسکردنی ئەو شتانەی دەیزانی:

- کۆتا پێغەمبەر لە ناوماندایە.

خاتوو خەدیجە ڕاچڵەکی. دڵی خەریك بوو لە لێدان دەکەوت. وەرەقە هەروەك ئەوەی لە کتێبێکەوە شت بخوێنێتەوە بەردەوام بوو لەسەر باسکردنی ئەو شتانەی کە دەیزانی و یەکە یەکە لەسەر وشەکان ڕادەوەستا:

- ئەو، یەکێکە لە تیرەی قوڕەیش... لە نەوەکانی هاشم... تۆش دەبیت بە هاوسەری ئەو!

خاتوو خەدیجە کۆتا ڕستەی وەرەقەی لە مێشکی خۆیدا دووبارە کردەوە: "تۆ دەبیت بە هاوسەری ئەو!" ئەمە واتای چی بوو؟ تۆبڵێی بەهەڵە تێگەیشتبێت؟ پاشان بە مەراقەوە پرسی:

- من دەبم بە هاوسەری ئەو؟



وەرەقە وتی:

- بەڵێ ئەی خەدیجە! تۆ دەبیت بە هاوسەری. لە کاتێکدا تۆ هاوسەری ئەویت یەکەم سرووشی بۆ دێت. تۆ دەبیت بە یەکەم کەس کە باوەڕی پێدەهێنێت. پاشان دینەکەی ئەو بەهەموو دونیادا بڵاو دەبێتەوە.

خاتوو خەدیجە ویستی بڵێت: "جا خۆ من بە هیچ شێوەیەک

بیر لە شوکردن ناکەمەوە.“ بەڵام پەشیمان بووەوە.

دووبارە بیری لە خەونەکەی کردەوە و لە دڵی خۆیدا وتی:
”دەبێت بوون بەهاوسەری پێغەمبەر چۆن بێت؟“

وەرەقە هەروەك ئەوەی لە دڵی ئەودا بێت دەستی کرد بە باسکردنی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەری چاوەڕوانکراو و وتی:

- ئەو، ڕەوشتی جوانە. لە بازاڕدا دەنگەدەنگ و هاوار ناکات. خراپە بە خراپە وەڵام ناداتەوە. لێبوردەیی و لێخۆشبوونی زۆرە.

خەدیجەی دایکی ئیمانداران شۆك بوو. دەتوت هەموو ئەو شتانەی لە مێشکیدا دەیزانی سڕابوونەوە. زمانی تەتەڵەی دەکرد و بەم شێوەیە لەوەرەقەی پرسی:

- ئەی ئامۆزای دانام، تۆ ئەم شتانە چۆن دەزانیت؟

وەڵامی ئەم پرسیارەی چەندین جار لێوە بیستبوو. مەحاڵ بوو بیری چووبێتەوە، چونکە خاتوو خەدیجە خاوەنی زرنگییەکی بێوێنە بوو. بەڵام دیسان وەرەقە هەروەك ئەوەی یەکەم جار بێت پێی بڵێت دەستی کرد بەباس کردن:

- تەورات و ئینجیل هەواڵی هاتنی دەدەن.

بەمە دەستی پێکرد و یەکەیەکەی وتەکانی بۆ شی کردەوە.

دایکە خەدیجە بە سەرنجەوە گوێی لە قسەکانی گرت و پرسیارێکی تری کرد:

- وا باسی دەکەیت دەڵێیت لەبە ردەمتدا ڕاوەستاوە. باشە

دەتوانی پێم بڵێیت سیمای چۆنە؟

- بەپێی ئەوەی لە ئینجیلدا خوێندوومەتەوە، باڵای کورت نییە، مامناوەندە. ڕەنگیشی سپی‌یە و لە نێوان هەردوو شانیدا مۆری پێغەمبەرایەتی هەیە. خێر وەرناگرێت. سواری گوێدرێژ و وشتر دەبێت. شوانی دەکات و مەڕ دەدۆشێت. جلی پیناوی لەبەردەکات و ناویشی ئەحمەدە.

دایکە خەدیجە تەمەنی لە سەروی سی ساڵەوە بوو. لەکاتێکدا هەموو داخوازیکەرەکانی ڕەت دەکردەوە. ئەم خەونە هەموو بیرکردنەوەکانی ئەوی گۆڕی. دەستی کرد بە ئامادەکاری بۆ هاوسەرگیرییەکی تازە. بۆ ئەوەی شایانی هاوسەریی پێغەمبەر بێت بەردەوام خۆی پێ دەگەیاند. خۆی تەرخان کرد بۆ زانست. بەردەوام دەچووە لای وەرەقە بۆ ئەوەی وانەی تازەی لێ فێربێت. لە ئینجیل و تەوراتیان دەکۆڵیەوە. ئەو ژیانە پاکەی کە هەیبوو زیاتر ئاگای لێدەبوو. هەستیارانە ڕەفتاری دەکرد بۆ ئەوەی پاکیزەیی ئەو ژیانە پاکەی هەیبوو بیپارێزێت.

ئەویش وەك وەرەقە باوەڕی بەو ئاینە هەبوو کە حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) بانگهێشتی بۆ دەکرد. زوو زوو بۆ عیبادەت کردن دەچوو بۆ کەعبە. تەماشای ئەو بتانەی دەکرد کە ڕۆژ بەڕۆژ لەناو کەعبەدا زیادیان دەکرد و لە دواکەوتووی و نەزانی مرۆڤەکانی سەردەمەکەی دڵگران دەبوو.

* * *

# شووی پێ بکە

لەگەڵ گەڕانەوەی دواهەمین کارواندا خاتوو خەدیجە قازانجێکی باشی دەستکەوتبوو. ڕۆشت بۆکەعبە و سوپاسی خوای گەورەی کرد. لەو کاتەدا مرۆڤە هەژارەکان هاتنە بیری و داوای بەزەیی خوای گەورەی بۆ کردن. زۆری پێناخۆش بوو کە مرۆڤەکان وەك کاڵا دەکڕدران و دەفرۆشران. کاتێك تەوافی کەعبەی دەکرد بۆ ئەم شتانە دەگریا.

خەڵکی چاوەڕێی یەکێکیان دەکرد تا ڕزگاریان بکات. خاتوو خەدیجە، بڕوای وابوو ئەو ڕزگارکەرە کۆتا پێغەمبەرە. خۆزگەی دەخواست یەکەم هاوسەری کۆتا پێغەمبەر خۆی بووایە. ئەمە شەرەفێکی مەزن دەبوو بۆ ئەو، بەڵام پێی وابوو کە چاککردنی ئەم خەڵکە کارێکی ئاسان نەبێت.

خاتوو خەدیجە لە دڵی خۆیدا وتی: "کارەکەت گەلێك گرانە

ئەی پێغەمبەر.“ پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

لە ڕێگادا چاوی بە کۆمەڵە ژنێك کەوت خەریکی قسەی خۆش بوون پێکەوە، ئەویش چووە لایان. زۆری پێنەچوو پیاوێکی بێگانە هاتە لایان و وتی:

- ئەی ژنانی مەککە! ئەی ژنانی مەککە!

هەموو نیگاکان ڕوویان کردە پیاوەکە.

پیاوەکە بەشڵەژاویەوە وتی:

- بێگومان بەم نزیکانە پێغەمبەرێك لەم ناوچەیەدا پەیدا دەبێت. ناویشی "ئەحمەد"ە. کەس لەناوتاندا خۆی بەدوور نەگرێت لە شەرەفی هاوسەرگیری لەگەڵیدا!

ژنە بتپەرستەکان بە بیستنی وشەی "پێغەمبەر" نارەحەت بوون. تەنانەت هەندێکیان بەردیان گرتە پیاوەکە و بە وتنەوەی "شێتە، شێتە" ڕاویان نا. بەڵام خاتوو خەدیجە لە جێگەی خۆی نەجوولا.

تەنها کەس کە لە قسەکانی پیاوەکە تێگەیشت، خاتوو خەدیجە بوو. ئەم پیاوە باسی ئەو پێغەمبەرەی دەکرد کە خاتوو خەدیجە لە خەونەکەیدا بینیبووی.

* * *

# سوڵتانی خەونەکان

جەنگە یەك لەدوای یەکەکانی مەککە گوزەرانی خەڵکەکەی بەتەواوەتی سەخت کردبوو. بەڵام خاتوو خەدیجە کەلوپەلێکی زۆری هەبوو. دەشیویست ئەم کەلوپەلانە لە شام بفرۆشێت. بۆ ئەم مەبەستە بەدوای کەسێکدا دەگەڕا کە ڕاستگۆ و دەستپاك بێت تا بیکات بە سەرۆکی کاروانەکەی.

کە ئەبوتالیب ئەم هەواڵەی بیست یەکسەر خۆی گەیاندە لای موحەممەدی ئەمین و پێی وت:

- برازای شیرینم! دونیا خراپ بووە و خەم و خەفەت و کێشەکان زیادیان کردوە. ئێمەش وا هەژار کەوتووین. من پیاوێکی بێسامانم و توانای بازرگانیشم نەماوە. چەند کاروانێك هەیە دەیانەوێت لە مەککەوە بەرەو شام بکەونە ڕێ. یەکێك لەم کاروانانەش هی خەدیجەی کچی خوەیلیدە و بە دوای کەسێکی متمانە پێکراو و ڕاستگۆ و دەستپاکدا دەگەڕێت تا لەگەڵ

کاروانەکەیدا بینێرێت. لەو بڕوایەدام بێ دوودڵی تۆ پەسەند دەکات.

پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) وتی:

- لەوانەیە خەدیجە خۆی هەواڵمان بۆ بنێرێت.

ئەبوتالیب وتی:

- من وەك تۆ بیر ناکەمەوە. دەکرێت ئەو ئەم کارە بە یەکێکی دیکە بسسپێرێت. بۆیە من ڕام وایە هیچ کات بە فیرۆ نەدەین و داوای ئەم کارەی لێبکەین.

- مامە گیان تۆ چۆنت پێباشە با ئەوە بکەین.

پاشان ڕاستەوخۆ عاتیکە خاتوونی پوری پێغەمبەرمان هەستا بە گەیاندنی ئەم داواکارییە.

خاتوو خەدیجە ئەوەی بیستبوو کە موحەممەدی ئەمین کەسێکی سەرڕاست و متمانە پێکراو و خاوەن ڕەوشتێکی بەرزە. بەڵام بیری لەوە نەدەکردەوە ئەم کارە پەسەند بکات بۆیە وتی:

- لەو باوەڕەدا نەبووم بەدوای کاردا بگەڕێت.

هەربۆیە یەکسەر ڕازیبوو کە بیکاتە سەرقافڵەی کاروانەکەی. گەر پێویستی بکردایە کرێی زیادیشی دەدایە. بگرە ئامادەبوو پارەیەکی باشتریشی لە بەرامبەر ئەنجامدانی ئەم ئەرکەدا پێ بدات.

زۆری پێنەچوو پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) هاتە لای خاتوو خەدیجە. دایکی ئیمانداران کە لە بەرامبەریدا پێشەوای

سەروەرمانی بینی لە دڵی خۆیدا یەکسەر وتی: "ئەمە ئەو کەسەیە کە بەدوایدا دەگەڕێم." پاش ماوەیەکی کەم لە بێدەنگی خۆیان ناساند. لە کاتی قسەکردندا پێغەمبەرمان لە ڕەوشت بەرزیی خۆی سەری بەرز نەدەکردەوە. خاتوو خەدیجە یەکسەر چووە سەر بابەتە سەرەکیەکە و وتی:

- کاروانێکم هەیە بەرەو شام. لەمێژە بەدوای کەسێکی ڕەوشتبەرزی دەستپاکدا وێڵم تا بیکەم بە سەرقافڵەی کاروانەکەم. دەزانم تۆ هەرگیز درۆ ناکەیت و ئاگات لە سپاردەکان دەبێت. بۆیە گەر داواکاریەکەم پەسەند بکەیت و سەروکاریی کاروانەکەم بکەیت، ئەوا کرێیەکت دەدەمێ تا ئێستا بەکەسم نەداوە.

پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لەسەر بێت) داواکاریەکەی پەسەند کرد و گەڕایەوە بۆ لای ئەبوتاڵیبی مامی



کرد، ئەم هەواڵە پڕ مزگێنیەی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) زۆر کاریکردە سەر ئەبوتاڵیب تا ئەوەی بە برازاکەی وت:

-ئەی برازای ئەزیزم! ئەمە لوتفێکی خوای گەورەیە بۆ تۆ. بەڵام ئەوەندەی بیستوومە خەدیجە دوو وشتری نێرینە دەدات بەوانەی کاری بۆدەکەن، بەڵام من ڕازی نیم تۆ تەنها بەوەندە کاری بۆ بکەیت. ئەگەر لەبارەی ئەم بابەتەوە قسەی لەگەڵدا بکەین ئەوا شتێکی باش دەبێت. پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لەسەر بێت) بەو مەبەستەی کە بڵێت: "باشە با قسەی تۆ بێت!" تەماشای مامی کرد. ئەبوتاڵیبیش لە واتای ئەم ڕوانینە گەیشت. هەر بۆیە یەکسەر خۆی ئامادەکرد و کەوتە ڕێ. لە ڕێگادا ئەو قسانەی ڕێك دەخست کە دەیویست



و باسی گفتوگۆکانی نێوان خۆی و خاتوو خەدیجەی بۆ مامی بە خەدیجەی بڵێت. بەنیاز بوو باسی تایبەتمەندی ناوازە و بەناوبانگی پێغەمبەرمان بکات.

ئەوەندەی پێنەچوو لە دەرگای ماڵی خاتوو خەدیجەی دا. دایکی ئیماندارانیش کە ئەبوتاڵیبی بینی بەخێرهاتنی کرد و پاشان لەلای سەرەوەی ژوورەکەدا داینیشاند و هەواڵپرسی کرد.

پاش ئەوە کە ئەبوتاڵیب باسی گەورەیی و کەسایەتییە باوەڕپێکراوەکەی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) کردو وتی:

- ئەی خەدیجە، هەواڵی ئەوەم بیست کە تۆ لە کرێی ئەمکارەدا دوو وشتر دەدەیت. بەڵام هەمووان دەزانن برازاکەی من چەندە کارزان و دەستپاك و متمانەپێکراوە. هەر بۆیە من داوای دوو قاتی ئەو کرێیەت لێدەکەم.

دایکی ئیمانداران کە بۆی دەرکەوت ئەبوتاڵیب بۆ ئەم داواکارییە ڕێگای بڕیوە و هاتووە بۆ لای، زۆری پێ ناخۆش بوو. بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا وتی:

- ئەی ئەبوتاڵیب! لەڕاستیدا بگرە من ئەو کرێیەی کە تۆش داوای دەکەیت زۆر بەلامەوە کەمە. ئەم کرێیە هەر شایانی ئەو نییە. ئەگەر داوای چەند باری ئەوەشت بکردایە بە بێ دوودڵی پێم دەدایت. چونکە کەس نییە ڕەوشتە بەرزەکەی ئەو نە ناسێت.

ئەبو تالیب نەیدەزانی مامەڵەکەی ئەوەندە بە ئاسانی کۆتایی پێدێت. پاش ئەوەی لەسەر کرێکە ڕێککەوتن، بڕیاریان لەسەر

ئەوەش دا کە لە چ ڕۆژێکدا کاروانەکە بکەوێتە ڕێ.

ئەو ڕۆژەی کە کاروانەکە دەکەوتە ڕێ، جۆش و خرۆشێکی جیاواز لە خاتوو خەدیجەدا بەدی دەکرا. لێهاتووترین خزمەتکاری کە ناوی "مەیسەرە" بوو بانگی کرد و پێی وت:

-بڕوانە مەیسەرە! سەرق افڵەی ئەم کاروانە موحەممەدی ئەمینە. بۆیە دەبێت گوێڕایەڵیی هەموو فەرمانێکی بکەیت و لە قسەی دەرنەچیت.

مەیسەرە ویستی بڵێت "باشە گرنگیی ئەم پیاوە لەچیدایە؟" بەڵام خاتوو خەدیجە یەکسەر قسەکانی بڕی و وتی:

- سەرەڕای ئەمەش دەبێت کە گەڕانەوە، تۆ هەموو ئاکار و هەڵسوکەوتەکانیم بۆ بگێڕیتەوە.

مەیسەرە پاش ئەم قسەیە هەر ئەوەی بۆمایەوە بڵێت "بەسەرچاو".

لە کۆتاییدا کاروانەکە لە مەککەوە بەڕێکەوت تا دەست بکات بە گەشتە سێ مانگییەکەی بەرەو شام.

* * *

# گەڕانەوە

کاتێك ماوەی گەڕانەوەی کاروانەکە نزیك بووەوە، جارجار خاتوو خەدیجە دەچووە سەربانی ماڵ و تەماشایەکی ڕێگاکەی دەکرد. ئەم جارەیان حاڵی ئەو جیاواز بوو، بە شێوەیەك بوو لە سەربان نەدەهاتە خوارەوە. هەرچی دەکرد، کات تێنەدەپەڕی. لە کۆتاییدا ئەو ساتە هات کە چاوەڕێی دەکرد، کاروانەکە دەرکەوت، بەڵام شتێکی بەرچاو کەوت کە سەرسامی کرد. تەماشای کرد وا هەورێك بەسەر کاروانەکەوەیە و هێدی هێدی لەگەڵیاندا دێت.

هەر ئەوەندەی کاروانەکە گەیشت، لەبارەی ئەم ڕووداوە ناوازەیەوە پرسیاری لە مەیسەرە کرد. ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

- ئەم هەورە بەدرێژایی گەشتەکەمان هەر لەگەڵمان بوو.

خاتوو خەدیجە قاپێك خورمای تازە پێگەشتووی هێنا و

لە بەردەم پێغەمبەری خۆشەویستماندا داینا. سەرووەرمان تێری لەخورمای ناو قاپەکە خوارد، بەڵام خورمای قاپەکە هیچ کەمی نەکرد. ئەمەش زۆر سەرنجی خەدیجەی ڕاکێشا.

پێش هەموو شتێك قازانجەکەیان حساب کرد. خاتوو خەدیجە بینی کە قازانجێکی زۆری دەست کەوتووە. بەڵام ئەو دڵی لەسەر پارەو پول نەبوو. هەردەم بیری لەوە دەکردەوە کە باشە تۆ بڵێیت ئەم "موحەممەدی ئەمین"ە هەر ئەو دواهەمین پێغەمبەرە بێت کە وەرەقە باسی لێوە دەکات و ئەم هەمیشە خەونی پێوە دەبینی.

مەیسەرە دەستی کرد بەگێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە سەیرانەی کە بە درێژایی گەشتەکەیان بەسەریاندا هاتبوو. خاتوو خەدیجە چەند گوێی بگرتایە ئەوەندەی تر سەرسام دەبوو.

- هەر کە کاروانەکە بەڕێکەوت، یەکسەر کەوتمە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانت. کە لە مەککە دەرچووین وتەکانی تۆم بەجێ هێنا؛ لە وشترە لاوازەکە دامبەزاند و ئەو جلانەی تۆ پێتدابووم، پێم لەبەرکرد. پاشانیش سواری ئەو وشترە ڕازێنراوەم کرد کە تۆ ئامادەت کردبوو. بەم کردارەی من ئەبوجەهل و شەیبە زۆر توڕەبوون و وتیان: "ئەم هەموو ڕێزگرتنە چیە لەم هەتیوە! ئەو جلانەی لەبەر دابکەنە و جلە کۆنەکانی پێ لەبەربکەوە. کارە زەحمەتەکان بەو بسپێرە، تا نەتوانێت کارەکانی جێبەجێ بکات و لە ژێریدا ڕاست نەبێتەوە." من گوێم بەوان نەداو وتم: "بەئێوە چی؟ خۆ من کۆیلەی ئێوە نیم، تەنها خەدیجە دەتوانێت فەرمان بە من بکات."

خاتوو خەدیجە دوای ئەم قسانە لە ئەبو جەهل و شەیبە

تووڕەبوو پرسی:

- باشە کەس پشتگیری ئێوەی نەکرد؟

- ئەی چۆن! ڕووبەڕوویان بوویەوە.

دایکی ئیمانداران زۆر بەوە دڵخۆش بوو کە حوزەیمەی خزمی پشتگیری لێکردوون. وەك ئەوەی شتێکی بینیبێت ماوەیەك تەماشای ئاسمانی کرد و، وتی:

- ئێ، بەردەوام بە لە گێڕانەوە! چیی ترتان بەسەردا هات؟!!

مەیسەرە بەردەوام بوو:

- پاش ئەوەی باری کاروانەکەمان فرۆشت، ڕۆشتین بۆ بازاڕ، تا هەندێك کەلوپەل بکڕین. لە شوێنێکدا دەستی کرد بە مامەڵەی هەندێك کاڵا، فرۆشیارەکە بارەکەی سەر حوشترەکەی پیشاندا و پاشان داوای لێکرد کە سوێند بە بتەکان بخوات. بەڵام ئەو وتی: "من سوێند بەبتەکان ناخۆم! لەڕاستیدا شتێك نیە هێندەی ئەو بتانە لە بەرچاوم ناشیرین بن." فرۆشیارەکە ئەبڵەق بوو و نەیزانی چی بڵێت. نازانم بیری لە چی کردەوە، بەڵام بێ ئەوەی درێژەی بداتێ شمەکەکانی پێفرۆشتین.

خاتوو خەدیجە وتی:

- کەواتە سوێندی بە بتەکان نەخوارد؟

مەیسەرە بەسەر بەڵێی بۆ کرد. خاتوو خەدیجە مەراقی ڕووداوەکانی دواتری دەکرد، بۆیە پرسی:

- ئێ، ئەی پاشان چی ڕوویدا؟

- پیاوەکە نزیکم بووەوە و پرسی: ”ئەو کابرایە دەناسیت؟ ئەمە کێیە ئەم پیاوە؟“ بەڵام بیٚ ئەوەی مۆڵەتم بدا وەڵامی بدەمەوە خۆی وتی: ”ئامان لێی دوورنەکەویتەوە! بێگومان ئەو پێغەمبەرە.“

خاتوو خەدیجەش مەراقی سەرەکی ئەمە بوو، هەر بۆیە مەیسەرەشی لەگەڵدا ناردبوو. بەچاوێکی پڕ لە تاسەوە ڕوانیە مەیسەرە وەك بڵێت "بەردەوام بە". دەیویست بزانێت چی تر ڕوویداوە.

مەیسەرە بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوە:

- کارەکانمان تەواو بووبوو و دەگەڕاینەوە. لەبەر ئەوەی هەوا زۆر گەرم بوو، لە ڕێگادا لە شوێنێك لاماندا تا پشوویەك بدەین. قەشەیەك هات بۆلام. بەدەم سوێند خواردنەوە پێی وتم: ”من بە قەشە "نەستورا" ناسراوم! ئەوەی لە ژێر ئەم درەختەدا دانیشتووە کۆتا پێغەمبەرە.“

پاشان قەشە نەستورا چووە لای موحەممەدی ئەمین و پێی وت: ”من شایەتی دەدەم تۆ ئەو دواهەمین پێغەمبەرەیت کە لە کتێبی پیرۆزی ئێمەدا باس کراوە. زۆر لەم ناوە ڕامەوەستن... نەوەك بەڵایەکتان بەسەردا بێت!“ ئینجا نێوچاوانی پیرۆزی ماچ کرد.

خاتوو خەدیجە پاش ئەوەی بە سەرنجەوە گوێی بۆ تەواوی بەسەرهاتەکان گرت، وتی:

- ڕێك وەك ئەوەی وەرەقە باسی کرد.

مەیسەرە بەردەوام بوو لەقسەکانی:

- کە قەشەکە ئەمەی وت، ترسم لێنیشت. چونکە وتەکانی ڕاست بوو. لەوانەبوو شتێکمان بەسەربێت چونکە ڕێگاکەمان مەترسیدار بوو.

پاشان مەیسەرە دەستی کرد بە باسکردنی چەند بەسەرهاتێکی سەیر و ناوازە کە بریتی بوون لە؛ ئەو دوو باڵندەیەی کە لەو هەتاوە گەرمەدا بەسەر سەری پێغەمبەرمانەوە دەفڕین و سێبەریان بۆدەکرد. هەروەها هاتنە دەرەوەی ئاو لە ژێر پێیەوە و نوورەکەی نێوچەوانی و زیادبوونی ئەو خواردنانەی کەدەستی بۆ دەبردن و چاککردنەوەی وشترە نەخۆشەکان. ئا لەم کاتەدا زەردەخەنەیەکی شیرین کەوتبووە سەر لێوی خەدیجە خاتوون.

دایکی ئیمانداران داوای لە مەیسەرە کرد ئەو شتانەی بینیویەتی لە خەڵکی بشارێتەوە و باسی نەکات. ئەویش گوێڕایەڵیی خۆی دەرخست و بەجێی هێشت.

پاش قسەکان، خاتوو خەدیجە بەرەو ماڵی وەرەقەی کوڕی نەوفەل کەوت ڕێ و هەموو شتێکی وەك خۆی بۆ باس کرد.

وەرەقەش پاش گوێگرتن پێی وت:

- موحەممەدی ئەمین دەبێت بە پێغەمبەر. گومان لەمەدا نەماوە.

* * *



# هاوسەرگیریی پیرۆز

ئەو خەونە یەك لە دوای یەكانەی خاتوو خەدیجە لەو یەك دوو ساڵەی دواییدا دەیبینی دیسانەوە بەرەو شووكردن پاڵی پێوە نایەوە. هەر دەتوت خەونەكانی تەواوكەری یەكتری بوون. بووە خاوەن زانیارییەكی زۆر لە بارەی پێغەمبەرایەتییەوە. پاش ئەوەی بەتەواوی بڕوای بەوە هێنا كە موحەممەدی ئەمین دواهەمین

پێغەمبەرە، بڕیاری خۆی دا. دەبێت ببێت بە هاوسەری ئەو. دەستی کرد بە بیرکردنەوە لە چۆنێتیی ڕاگەیاندنی ئەم داواکارییە بە حەزرەتی محمد.

ڕۆژێك نەفیسەی هاوڕێی نزیکی پێی وت:

- زۆر پەرێشان دیاریت، چیتە؟

خاتوو خەدیجە ماوەیەك بە بێدەنگی مایەوە و وتی:

- تایبەتمەندییەکی مەزن لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵادا بەدی دەکەم کە لە کەسی تردا نیە. بەڕای من باشترین مرۆڤە کە ژنێك دەستی بکەوێت. لە سەرووی ئەمانەشەوە چەندین هەواڵی پڕ مزگێنیم دەربارەی ئەو گوێ لێبووە.

نەفیسە لەبەرئەوەی لە هۆکاری سەرەکیی ئەم وتانە تینەدەگەیشت، لێی پرسی:

- ئێ باشە. بەڵام هۆکاری ئەم ڕەنگ زەردی و لاوازییەی تۆ چیە؟

خاتوو خەدیجە هاتەوە سەرخۆی و بیری کردەوە باشترین شت ئەوەیە هەموو بابەتەکەی بە ئاشکرا بۆ باس بکات:

- دەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم، بەڵام نازانم چۆن ئەمەی پێبڵێم.

- ئەگەر مۆڵەت بدەیت، دەچم دەمی تاقی دەکەمەوە.

- گەر دەتوانیت، هەر ئێستا دەست پێبکە.

نەفیسە بەبێ کات بەفیڕۆدان خۆی گەیاندە لای حەزرەتی

موحەممەد، پاش سڵاو کردن دەستیان بە قسەکردن کرد:

نەفیسە لێی پرسی:

- هیچ شتێك هەیە ڕێگری هاوسەرگیریت لێبکات؟

لە بەرامبەر ئەم پرسیارە چاوەڕوان نەکراوەدا پێغەمبەری خۆشەویستمان سوور هەڵگەڕا و سەری داخست و وتی:

- توانای ژن هێنانم نیە.

- ئەی ئەگەر ئەم کێشەیەت چارە بکرێت و کەسێك کە لە ڕووی دەوڵەمەندی و ڕەوشت و جوانییەوە بێ کەموکوڕی بێت ببێتە هاوسەرت، دەڵێیت چی؟

پێغەمبەری نازدارمان لە نیەتی نەفیسە تێگەشت. هەستی کرد کە لەپشت ئەم پرسیارانەوە کەسێك هەیە. بۆیە ئەم پرسیارەی بە پرسیارێکی تر وەڵام دایەوە و وتی:

- باشە، ئەوە کێیە ئەو کەسە؟

- خەدیجە...

- جا ئەم کارە چۆن دەبێت؟

نەفیسە کاتێك وەڵامی چاوەڕوانکراوی چنگ کەوت، هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و وتی:

- تۆ ئەم کارە بۆ من بەجێبێڵە، خۆم ڕێکی دەخەم.

پاش ئەم قسەیە پێغەمبەرمان هیچی تری نەوت. نەفیسە بێ چاوەڕێکردن بەرەو ماڵی خەدیجە گەڕایەوە.

حەزرەتی پێغەمبەر یەکسەر بابەتەکەی لای ئەبوتاڵیبی مامی باس کرد. پاش ماوەیەکی کەم هەریەك لە ئەبوتاڵیب و عەباس و حەمزەی مامەکانی پێغەمبەر بە مەبەستی خوازبێنی کردنی خەدیجە چوونە ماڵی عەمری کوڕی ئەسەد. خەدیجە تا بڵێی بەپەرۆش بوو. گفتوگۆیەکی گەرم دەستی پێکرد. لە دوورەوە هەردوولا خزمایەتییەکی دووریان هەبوو، ئەم هاوسەرگیرییەش پەیوەندییە خزمایەتییەکەیانی پتەوتر دەکرد. پاش ئەوەی کاتێکی زۆر تێپەڕی، ئەبوتاڵیب وتی:

- سوپاس بۆ ئەو بەدیهێنەرەی کە ئێمەی لە ناو نەوەکانی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمدا بەدیهێناوە. پاشان دەستی کرد بە باسکردنی ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەرمان و لەکۆتاییدا وتی:

- موحەممەد داوای خەدیجەی کچتان دەکات. بۆ مارەییش پەیمانی ٥٠٠ درهەم ئاڵتون دەدات بەو شێوەیەی بەشێکی بەپێشەکی بدرێت.

خاتوو خەدیجەش وەك پێغەمبەری خۆشەویستمان باوکی لە ژیاندا نەمابوو. هەر بۆیە عەمری کوڕی ئەسەدی مامی سەرپەرشتی دەکرد. ئەویش زۆر قسەی نەکرد و وتی:

- ئەوە من خەدیجەی کچی خوەیلیدم لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا مارە کرد بەرامبەر بەو مارەییەی کە باسکرا.

ئەبوتاڵیب بۆئەوەی هەست بە بەرپرسیاری بکەن، ڕووی کردە براکانی و وتی:

- دەمەوێت هەموومان بەشداری ئەم پەیمانی هاوسەرگیرییە

ببین.

بۆیە یەکێکیان وتی:

- ئێوەش شاهید بن کە ئەوە خەدیجەی کچی خوەیلیدمان لە موحەممەدی عەبدوڵڵا مارەکرد. هەروەها ڕۆژی ئاهەنگەکەش دیاری کرا.

ئەو خەدیجەیەی کە بەدەوڵەمەندی و جوانی و ئازایی ناوبانگی دەرکردبوو، لەمەودوا دەبوویە بەختەوەرترین ژنی دونیا.

پاش سێ هەفتە ئاهەنگی گواستنەوەیان گێڕا! پاش ئاهەنگەکە بە پێغەمبەرمانی وت:

- ئەی موحەممەد، بڕۆ بۆلای ئەبوتاڵیبی مامت و پێی بڵێ یەك دوانێك لە وشترەکانی تۆ سەرببڕێت و بیکەنە خوانی میوانەکان.

پێغەمبەری ئازیزیش ئەم داواکارییەی جێبەجێ کرد.

* * *

# دایکی شیری

خاتوو خەدیجە لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو بە خاوەنی خێزانێکی بەختەوەر. لە سەرەتای ڕۆژانی هاوسەرگیریاندا، خاتوو حەلیمەی دایکی شیری سەروەرمان هات بۆ سەردانیان.

خاتوو خەدیجە هەر کە ئەوی بینی دەستی کردە ملی و پێی وت:

- دایە گیان بەخێربێیت.

ئەم خۆشەویستیە قووڵە خاتوو حەلیمەی سەرسام کرد. بەدرێژایی میوانداریتیەکەی، دایکی ئیمانداران خزمەتێکی زۆری کرد و بە هیچ شێوەیەك لە خزمەت و ڕێزلێگرتنیدا درێغی نەدەکرد. لە کاتی قسەکردندا خاتوو حەلیمە دەردی دڵی خۆی بۆ باس کرد و وتی:

- بەهۆی وشکە ساڵیەوە ئاژەڵەکانمان لاوازبوون. برسی و تینوو نین بەڵام حاڵمان پەرێشانە.

خاتوو خەدیجەش یەکسەر هاتە وەڵام:

-تۆ هیچ خەم مەخۆ. ئێمە ئامادەین ئەوەی هەمانە لەگەڵتاندا بەشی بکەین.

خاتوو حەلیمە شەیدای ئەو دەوڵەمەندییەی خاتوو خەدیجە بوو. چەند ڕۆژێك میوانی لانە پیرۆزەکەیان بوو.پاشانیش کە ڕۆژی ماڵئاوایی هات فرمێسکی چاوەکانی پێ ڕانەگیرا.

ئەو کاتەی خاتوو حەلیمە ویستی بکەوێتە ڕێ خاتوو خەدیجە دیارییەکی بۆ ئامادەکردبوو. یەکێك لەخزمەتکارەکانی بانگ کرد و وتی:

-ڕۆڵە لە گەورەکە چل مەڕ بژمێرە و وشترێکیش ئامادە بکە و بیاندە بە دایکم. خاتوو حەلیمە نەیدەویست دیارییەکی ئاوا گەورە وەربگرێت. بەڵام پاش زۆر



لێکردنی خاتوو خەدیجە پەسەندی کرد. ئینجا سواری ئەو وشترە بوو کە وەك بووك ڕازێنرابووەوە. مەڕەکانی خستە پێش خۆیی و بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوت.

ئەم سەردانە بوو بە یادگاریەکی لە بیرنەکراو لای دایکی شیریی پێغەمبەری خۆشەویستمان.



یەکێکی تر لە دایکە شیریەکانی پێغەمبەرمان خاتوو سوەیبە بوو. سوەیبە یەکێك بوو لە کۆیلەکانی ئەبولەهەب. پێشەوامان زوو زوو سەردانی دەکرد. دیاری بۆدەبرد

و بەخشیشی دەدایە. خاتوو سوەیبەش زوو زوو دەهاتە ماڵی پێغەمبەر و سەردانی دەکردن. ڕۆژێك لە کاتی قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەردا بابەتەکە گەشتە باسی خاتوو سوەیبە، خاتوو خەدیجە بە پێغەمبەری وت:

-ئەی محمد، با ئێمە سوەیبە لە ئەبولەهەب بکڕین.

پێغەمبەرمان بەشێوەیەکی وا تەماشای خەدیجەی کرد وەك ئەوەی بڵێت: ”جا چۆن دایك دەبێت بەکۆیلەی کوڕ!“



خاتوو خەدیجە وتی:

- بابیکڕین و ئازادی بکەین.

سەروەرمان بەم قسەیە زۆر دڵخۆش بوو، شەیدای ئەم بیرکردنەوە وردانەی هاوسەرەکەی بوو و پشتگیری لەم داواکارییە جوانەی خێزانەکەی کرد.

خەریك بوو خۆر لە ئاسۆدا ئاوا دەبوو. ئاسمان ڕەنگی گوڵێکی سووری گرتبوو. فێنکیەکی خۆش لەهەوادا بوو. مانگەشەو بۆئەوەی هەنگاو بە هەنگاو ئاگاداری ڕووداوەکان بێت لە ئاسماندا ئامادە بوو. سروشت هەروەك ئەوە وابوو کە چەپڵە بۆ سەروەرمان و خاتوو خەدیجە لێبدات کە کەوتبوونە ڕێ بۆ ئازادکردنی کەسێك. بە جۆش و خرۆش و هەندێك

ترسەوە گەیشتنە کۆشکەکەی ئەبو لەهەب.

یەکێك لە خزمەتکارەکانی ئەبو لەهەب دەرگای کردەوە. دەنگی قاقای پێکەنین لە ژوورەوە دەهات. لە ناکاو خۆشی و قاقای میوانەکان بچڕا. بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو.

ئەبو لەهەب لەسەر دۆشەکێکی ئەستور دانیشتبوو، بەهاتنی میوانەکان کەمێك سەرسام بوو، بۆیە برۆکانی لێکنا.

هەروەك دابونەریت هەندێك قسەیان کرد. ئەبو لەهەب وتی:

- ئەی برازام، خەمبار دیاریت... داواکاریەکت هەیە؟

پێغەمبەری خۆشەویستمان وتی هاتوون خاتوو سوەیبە بکڕن.

ئەبو لەهەب سەری زۆر لەم داواکارییە سوڕما. پاشان لە شوێنی خۆی هەستایە سەر پێ و وتی:

- دەزانم شیری بەتۆ داوە. خۆشەویستیی ئەو بەرامبەر بەتۆ بێ پایانە و تۆش ئەوت زۆر خۆش دەوێت. بەڵام ناتاندەمێ.

ئومێدەکانیان پووچ بوویەوە. ئەم کەشوهەوا ناخۆشە سەروەرمان و خاتوو خەدیجەی دڵتەنگ کرد. داوای مۆڵەتیان کرد و گەڕانەوە ماڵەوە.

ئیتر ئەوەبوو خاتوو سوەیبە هەروەك کۆیلەی ئەبو لەهەب مایەوە تا پاش ئەوەی موسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، ئەبو لەهەب هەر لەخۆیەوە خاتوو سوەیبەی ئازاد کرد.

* * *

# یەکەم میوە

یەکەم میوەی ئەم خێزانە دڵخۆش و بەختەوەرە منداڵێکی کوڕ بوو. پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لێبێت) ناوی کوڕەکەی نا قاسم. لەگەڵ لە دایك بوونی قاسمدا ماڵەکەیان ئەوەندەی ترخۆشی و بەختەوەری بەسەردا باری.

قاسم کە هەندێك گەورە بوو منداڵێکی خۆشەویستی لێدەرچوو. پێکەنینە جوانەکەی و ڕۆشتنە بەلەنجە و لارەکەی سەرچاوەی خۆشی و ئاسودەیی بوو. لە ماڵدا کەس لەم خۆشیە تێر نەدەبوو.

هێشتا تەمەنی نەبووبوو بە دوو ساڵ، ڕۆژێکیان لەناکاو تاکەی بەرز بووەوە و زۆر بە دەستیەوە دەیناڵاند. ئوم ئەیمەن کە قاسمی بەم شێوەیە بینی هێندەی نەمابوو لە هۆش خۆی بچێت. خەدیجەی دایکی ئیمانداران بۆ دابەزاندنی تاکەی قاسم زۆر

ڕێوشوێنی گرتە بەر، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو. ڕوخسارەکان ترسیان لێنیشت.

بارودۆخی قاسم زۆر پەرێشان بوو. تۆ بڵێیت بمرێت؟ کەس نەیدەویست باوەڕ بەمە بکات. ئەوانەی بۆ سەردانی نەخۆشەکە هاتبوون، لەنێوان خۆیاندا دەستیان کرد بە مقۆ مقۆ.

- تۆ بڵێی قاسم توشی چ جۆرە نەخۆشیەك بوویێت؟

پیاوێکی بتپەرست وتی:

- لەو باوەڕەدام توشی سزای بتەکان بوویێت.

کەسێکی مەسیحی بەشداری قسەکانی کرد و وتی:

- دەکرێت جادوی لێکرابێت.

ژنێکی سەر ئاینی حەزرەتی ئیبراهیم پرسی:

- ئەی تۆ بڵێی کاریگەری شتێك نەبێت کە خواردوویەتی؟

لەو کاتەی کە هەرکەس بە پێی ئاینەکەی خۆی هەوڵی دەدا لێکدانەوەیەك بکات، هاوار لە ژوورەوە بەرز بووەوە. وا قاسم گیانی دەرچوو.

ئەو ماڵەی کە هەمیشە پڕ بوو لە خۆشی و خۆشەویستی، ماتەمینی باڵی بەسەردا کێشا، بە ڕادەیەك گریان قورگی هەموانی گرتبوو.

یەکەم جار بوو کە تیایدا پێغەمبەری خۆشەویستمان تاڵی و ناخۆشی جەرگ سووتان بچێژێت. فرمێسکی چاوانی مەلۆتکەی جگەرگۆشەکەی تەڕ کرد. نزیکی نیوەڕۆ بە دەستە

پیرۆزەکانی خۆی منداڵە تاقانەکەی بە خاك سپارد.

پاش لە دایك بوونی قاسم، هەموو کەس پێغەمبەری خۆشەویستمانی بە باوکی قاسم بانگ دەکرد. کاتێك بە کۆلانەکانی مەککەدا هات و چۆی دەکرد ئەوانەی کە دەیان ناسی پێیان دەوت: ''باوکی قاسم چۆنی؟''

پاش قاسم، دایکی ئیمانداران یەك کوڕ و چوار کچی بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان هێنایە دونیاوە. پێشەوامان ناوی کچەکانی نا زەینەب، ڕوقیە، ئوم کەلسوم و فاتیمە. کوڕەکەی تریشی ناونا عبداللە. بەلام تا کۆتای تەمەنی هەر بە باوکی قاسم دەناسرا.

* * *

# تۆ دایکی منیت

پێغەمبەری ئازیز (دروودی خوای لێبێت) داوای لە خاتوو خەدیجە کرد زەیدی بداتێ. خاتوو خەدیجەش بە خۆشحاڵییەوە داواکاریەکەی جێبەجێ کرد. پێغەمبەری ئازیزیش زەیدی ئازاد کرد.

زەیدی بچکۆلە زۆر دڵخۆش بوو بەوەی بوو بە یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکە. خەدیجەی دایکی ئیمانداران زەیدی وەك منداڵی خۆی خۆش دەویست. بۆ هەر شوێنێك بڕۆشتایە ئەویشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. بە خواردنە بەتامەکانی و بەو دیاریانەی بۆی دەکڕی دڵخۆشی دەکرد. زەید بەتەواوی لەگەڵیاندا ڕاهات، بەڕادەیەك کە نەیدەویست هەرگیز لە پێغەمبەری خۆشەویستمان و خاتوو خەدیجە جیا ببێتەوە.

لە یەکێك لە وەرزەکانی حەجدا کۆمەڵێك لەخزمەکانی زەید

بەمەبەستی ئەنجامدانی حەج هاتن بۆ مەککە. پێغەمبەری خۆشەویستمان و خاتوو خەدیجە و زەیدیش لەوێ بوون. یەکێك لە خزمەکانی زەید، زەیدی ناسیەوە و چوو بۆلایان و پرسی:

- ئەی زەید، من دەناسیتەوە؟

- بەڵێ دەتناسمەوە.

- باوکت حاڵی پەرێشانە... هەردەم ناڵەی دێت و وێڵی تۆیە.

زەید بە بیستنی ئەم وتەیە دڵی زۆر تەنگ بوو. فرمێسکە بەخوڕەکانی ڕوومەتیان تەڕ کرد و وتی:

- من دەزانم ئەوان بەدوامدا دەگەڕێن و خەمی منیانە، بەڵام پێیان بڵێ با ئیتر خەم نەخۆن. من لە شوێنێکی ئەمیندام و لە ماڵی متمانەپێکراوترین کەسی مەککەدام.

گریان قوڕگی خاتوو خەدیجەی گرتبوو، بەزۆر ئەم چەند وشەیەی پێوترا:

- زەید، خۆ دەزانیت کە چیدی کۆیلە نیت. دەتوانیت خۆت بڕیاری خۆت بدەیت. بەهەرحاڵ، لە مانەوە یاخود لە ڕۆیشتنندا سەربەستیت.

زەید بە قوڵپەی گریانەوە ڕووی کردە سەروەرمان و خاتوو خەدیجەو وتی:

- دایك و باوکی من ئێوەن.

پیاوەکان بەسەرسامیەوە تەماشایەکی یەکتریان کرد. یەکێکیان وتی:

- دەی باشە، مادەم خۆی نایەوێت، با زۆری لێنەکەین.

خاتوو خەدیجە وەکو دایکێك، هەرگیز نەیدەویست هیچ دایکێك تاڵی دووری ڕۆڵەکەی بچێژێت، بۆیە بەخزمەکانی زەیدی وت:

- ئەی میوانانی مەککە! زەید لای ئێمەیە. بێگومان بن کە ئەومان لە منداڵەکانی خۆمان جیانەکردووەتەوە. هەر کاتێك دایك و باوکی بیانەوێت، دەتوانن بیبینن. زەید هەرکاتێك ویستی دەتوانێت بڕوات. تکایە ئەم شتانە بەدایك و باوکی ڕابگەیەنن.

پاشان میوانەکان داوای مۆڵەتیان کرد و ڕۆشتن.

دایکە خەدیجەمان کە سەیری بەڕێکەوتن و دوورکەوتنەوەی میوانەکانی کرد، ڕابردووی بیرکەوتەوە. کاتێك لەگەڵ پێغەمبەرمان هاوسەرگیری نەکردبوو، ماڵیان لە باخچەی ساوایان دەچوو. هەردەم پڕ بوو لە منداڵ.

لە ڕۆژێکی ئاوادا حاکمی کوڕی حیزام هاتبوو بۆ سەردانی و پرسیبووی:

- پورە خۆشەویستەکەم، دەچم بۆ بازاڕ هیچ کارێکت نیە؟

خەدیجە وتبووی:

- ئەگەر کۆیلەیەکی باشت دەستکەوت بۆم بکڕە.

حاکمی کوڕی حیزام لە گەڕانەوەیدا زەیدی کوڕی حاریسی لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە کە لە بازاڕ کڕیبووی. زەید، منداڵێکی تەمەن هەشت ساڵانی جوان بوو... هەر کە بینبووی، یەکسەر

چووبووه دڵیەوه. حەزرەتی خەدیجە وەك منداڵی خۆی تەماشای زەیدی دەکرد نەك وەك کۆیلەیەك. دەستی بەسەردا هێنا و نێوچەوانی ماچ دەکرد و لە حاڵی دەپرسی. جارێکیان و ئەم وتووێژه لەنێوانیاندا دروست بوو:

- چۆن کەوتیتە بازاڕی کۆیلەکانەوه؟

زەید بەچاوی پڕ فرمێسکەوه دەستی بە گێڕانەوه کرد:



- ڕۆژێك لەگەڵ دایکمدا لەماڵێك میوان بووین. دز هاتە سەر ماڵەکە و منیان لە دایکم جیاکردەوه. پاشان بردمیان بۆ بازاڕ و وەك کۆیلە منیان فرۆشت.

لە زەیدی پرسی:

- دایکت خۆش دەوێت؟

زەید فرمێسکەکانی سڕی و وەڵامی دایەوه:

- ئەی چۆن خۆشم ناوێت؟

خاتوو خەدیجە زۆر بەم وەڵامە خەم دەخوات، منداڵی بچووك نەدەبوو لە دایك و باوك جیابکرێتەوه. دەبوو منداڵەکە سپاردەی خێزانەکەی بکاتەوه، بەڵام نەیدەتوانی خێزانی ئەم منداڵە بدۆزێتەوه کە دزەکان لە یەمەنەوه ڕفاندبوویان و هێنابوویان بۆ بازاڕی کۆیلەکانی مەککە.

بۆیە خەدیجە پێی وت:

- تۆ هیچ خەم مەخۆ. من دەبم بەدایکت و ئەمانەش خوشك و برای تۆن.

بە دوورکەوتنەوە و لە بەرچاو ونبوونی میوانەکان، وردە وردە ئەم یادەوەرییانەش لە هۆشی خاتوو خەدیجە دوورکەوتنەوە. لەم ساتە ناسکەدا لەگەڵ زەیددا چاویان بەچاوی یەکتر کەوت.بینی وا چاوانی زەید لە خۆشیدا دەبریسکێنەوە.

* * *

# میوان

دەمەونیوەڕۆیەك زەید دوو كەسی بەدی كرد كە بەرەو ماڵی پێغەمبەری ئازیزمان دەهاتن. یەكێكیان باوكی و ئەوی تریش مامی بوو.

زەید یەكسەر ڕای كرد بۆ لای باوكی و دەستی ماچ كرد. باوەشیان بەیەكدا كرد و تا توانیان بۆنی یەكتریان هەڵمژی. پێغەمبەری خۆشەویستمان بە ڕوویەكی خۆشەوە پێشوازی لە میوانەكانی كرد. لە ڕێیەكی دوورەوە هاتبوون و لە ڕێگا چەند ڕۆژێكیان پێچووبوو، هەربۆیە زۆر هیلاك بوون.

خوانی میوانەكان ئامادە كرا. میوانەكان نەیاندەزانی چۆن سوپاسی ئەم میواندارییە بكەن. ڕووخۆشی پێغەمبەرمان و



خزمەتە جوانەکەی خاتوو خەدیجە، وای کرد هەر زوو بکرێنەوە و ئامانجی گەشتەکەیان ئاشکرا بکەن. حاریس بە زمانێکی پڕ بەزەیی باوکانەوە وتی:

- لەبەر زەیدی کوڕم هاتوومەتە بەردەرگاتان. هەندێك دڵتان نەرم بکەن بەرامبەرمان، با نرخەکەی بدەین و کوڕەکەمان ببەینەوە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان بە باوکی زەیدی وت:

- لەو باوەڕەدا نیم تەنها بە دانەوەی نرخەکەی ڕزگارتان بێت. دەڵێن چی ئەگەر هەوڵ بدەین بەشتی تر چارەسەری ئەمە

بکەین؟

- مەبەستتان چیە؟

- با بانگی زەید بکەین و گویێ لە بڕیاری خۆی بگرین. ئەگەر ویستی لەگەڵتاندا بگەڕێتەوە، ئەوا پێویست بە پارە ناکات و دەتوانن لەگەڵ خۆتاندا بیبەنەوە. بەلام ئەگەر بیەوێت لێرە بمێنێتەوە، ئەوا ئەوەی من هەڵبژێرێت بەهیچی ناگۆڕمەوە.

پاش ئەم وەڵامە باوك و مامی زەید وایانزانی کە ئیتر تەواو ویستەکەیان هاتووەتە جێ. تەماشایەکی یەکیان کرد و بەڕووی یەکتردا خەندەیەکیان نواند.

مامی زەید وتی:

- ڕێگایەکی زۆر گونجاوە.

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) بانگی زەیدی کرد و وتی:

- زەید، باوکت و مامت هاتوون لەگەڵ خۆیاندا بتبەنەوە. ئەوا ئێستا کاتی جیابوونەوەیە. بەڵام بڕیاری ڕۆشتن یا مانەوەت لە دەستی خۆتدایە. خۆت من دەناسیت و دەزانیت چەندە سۆز و بەزەییم بەرامبەرت هەیە... جا ئەگەر پێت خۆشە، ئەوا من هەڵبژێرە و لێرە بمێنەرەوە، ئەگەریش دەتەوێت لەگەڵ باوکتدا برۆ! بڕیاری خۆت بدە.

هەموویان تەماشای زەیدیان کرد. زەید بەشێوەیەکی زۆر لەسەرخۆ و بەشێوازێك کە زۆر لە تەمەنی خۆی گەورەتر بوو، وتی:

- من ناتوانم لە تۆ جیاببمەوە.

حاریس و کەعبی برای بڕوایان بەگوێی خۆیان نەدەکرد. لەجێی خۆیان سڕبوون. پاش چەند ساتێك واق وڕمان، حاریس بەزەیدی وت:

- ئەوە تۆ دەڵێیت چی کوڕی شیرینم؟ من باوکی تۆم...

- بەڵێ، ڕاستە تۆ باوکمیت، بەڵام...

- وەرەوە هۆش خۆت کوڕەکەم! تۆ لێرە کۆیلەیت. ئەگەر لەگەڵ ئێمە بێیت بە سەربەستی ژیان بەسەردەبەیت!

- بابە، من هەمیشە لێرە سەربەست بووم...

- ئەی تۆیان وەك کۆیلە نەفرۆشت؟ ئەمان تۆیان بەپارە نەکڕی؟

- ئەوانەی دەیڵێیت هەموو ڕاستن، بەڵام هەر لە یەکەم ڕۆژەوە منیان وەك کۆیلە تەماشا نەکردووە. من هەر بە تەنها خۆم دەچمە دەرەوە و دەسووڕێمەوە. ئارامییەکی وەهام لێرە بۆ دەستەبەر کرا کە هەرگیز لای ئێوە نەمدیبوو.

باوکی و مامی بەبیستنی ئەمە ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕا. لە تووڕەییدا ددانیان جیڕ دەکردەوە و هەڵدەلەرزین. بۆیە زەید بۆ دواجار بەچاوی پڕ فرمێسك و دەنگێکی پڕشەرم و ڕێزەوە وتی:

- ئیتر باوکم موحەممد و دایکم خەدیجەیە.

ئەم قسانە بەتەواوی پەرێشانی کردن. لە بەردەم ئەم بڕیارەی زەیددا بێدەنگ بوون. زەید وەفای خۆی پیشانی خاتوو خەدیجە و

پێغەمبەرمان دا. هیچ خراپەیەکی لەوەدا نەدەبینی کە بەرامبەر ئەو خۆشەویستی و ڕێزەی ئەوان ببێت بە منداڵیان.

حاریس، نەیدەتوانی بەرگەی ئەو پەیوەستیەی زەید بە پێغەمبەرمان و خاتوو خەدیجەوە بگرێت و وتی:

- مادەم ئەوەندە ئێوەی خۆش دەوێت، با لاتان بمێنێتەوە.

زەید، لەخۆشیاندا هاواری کرد.

پێغەمبەرمان لە بەردەم هەموو ئامادەبوواندا وتی:

- هەمووتان شاهێد بن، ئەوە لەمەودوا زەید کوڕ و میراتگری منە.

بەم وتەیە بۆ هەمووانی دووپات کردەوە کە ئیتر زەید نەك کۆیلەی نییە، بەڵکو کوڕی خۆیەتی.

* * *

# پەیژەی ئاسمانی

خاتوو خەدیجە بووبوو بە پەنجا و پێنج ساڵ و پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) بووبوو بە چل ساڵ. بۆماوەی پازدە ساڵ بوو هاوسەری یەکتر بوون. خۆشەویستیی نێوانیان لە یەکەم ڕۆژی هاوسەرگیریانەوە هیچ کەمی نەکردبوو، بگرە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیادی دەکرد.

ڕۆژێك پێغەمبەرمان خەونێکی جیاوازی بینی. ئەمەی بۆ خێزانە خۆشەویستەکەی گێڕایەوە:

- لە بنمیچی ژوورەکەدا کونێك کرایەوە و پەیژەیەکی لێوە هاتە ژوور. دوو پیاو بە پەیژەکەدا هاتنە خوارەوە، بەڵام لەو کاتەدا من زمانم بەسترا و هیچم پێنەوترا. یەکێکیان هات، یەکەمجار پەراسوویەکمی دەرهێنا و پاشان لێیەوە دڵمی دەرهێنا. ڕووی کردە ئەوەی تەنیشتی و پێی وت: "بنواڕە، دڵی ئەم مرۆڤە چاکە چەندە جوانە!" ئینجا دڵیان شۆردم و پاکیان کردەوە. لەکۆتاییشدا دڵیان خستمەوە جێی خۆی پاشان پەراسوومیان دانایەوە. ئینجا وەك چۆن هاتن، ئاوا بە پەیژەکەدا سەرکەوتنەوە و پەیژەکەشیان

لەگەڵ خۆیاندا برد، پاش ڕۆشتنیشیان، بنمیچی ژوورەکە وەکو جارانی لێهاتەوە.

خاتوو خەدیجە بە وردی گوێی لە هەموو وردەکارییەکانی خەونەکەی پێغەمبەری خوا گرت، پاشان پێی وت:

- مژدەت لێبێت! خوای گەورە کاری خێری گەورەی بۆ ئامادەکردوویت.

پاش ماوەیەك خاتوو خەدیجە لەگەڵ خەونی لەم چەشنە ڕاهات. بیری دەکردەوە کە بەم نزیکانە سەروەرمان مزگێنی پێغەمبەرایەتی پێدەدرێت.

لەم کاتانەدا پێغەمبەرمان پەرستشەکانی زۆرتر کردبوو. زۆر دڵتەنگی ئەوەبوو کە کەعبە پڕبووە لە بت. جارجار دەچووە چیای نوور و لە ئەشکەوتی حیرا عیبادەتی دەکرد.

* * *

# خوای گەورە شەرمەزارت ناکات

کاتی ئێوارە بوو. خاتوو خەدیجە خەوی لێنەدەکەوت. لە ناو جێگەکەیدا هەر ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد. تەنها کەمێك خەوی دەهات. هەر کە چاوی داخست یەکسەر لە دەرگای ماڵ درا. ئەم شێوە لە دەرگادانە لە هی پێغەمبەر دەچوو.

خاتوو خەدیجە بۆ ساتێك وای زانی خەون دەبینێت. بەڵام بە بیستنەوەی دەنگی تەقەی دەرگاکە بەهێواشی هەستا و بەرەو دەرگاکە ڕۆشت. کە گەشتە دەرگا، بۆنێکی وا خۆش هاتە بەرلووتی، لە ژیانیدا بۆنی وا خۆشی هەست پێنەکردبوو. کە گەشتە لای دەرگاکە پرسی:

- کێیە ئەوە؟

ئەوەی وەڵامی دایەوە پێغەمبەرمان بوو. بۆیە خاتوو خەدیجەش یەکسەر دەرگاکەی کردەوە. بە بینینی پێغەمبەری خوا زەردەخەنەیەکی شیرین سەرتاپای ڕوخساری داگرت و سڵاویان لەیەکتری کرد. پێغەمبەری ئازیز لە حاڵەتێکدا بوو کە بە دەگمەن لێی بەدی دەکرا. بەچاویدا دیار بوو کە لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدایە، وادیاربوو کێشەیەکی هەیە.

خەدیجە وتی:

- خۆشەویستم، باش نایەیتە پێش چاوم.

پێغەمبەرمان بەدەنگە نەرم و نیانەکەی دەستی کرد بەگێڕانەوە:

- ئەمڕۆ کە گەشتمە نێوان سەفا و مەروە گوێم لە دەنگێك بوو وتی: "ئەی محمد تۆ نێردراوی خوای گەورەیت و منیش جوبرەئیلم." دەنگەکە لە ئاسمانەوە دەهات. کە سەرم بەرز کردەوە شێوەی مرۆڤێکم بەدی کرد. منیش تا دیارنەمانی، لە شوێنی خۆم نەجوڵام.

پێغەمبەرمان دەترسا ئەوەی کە پێشچاوی کەوتووە شەیتان یان جنۆکە بێت، وتی:

- دەترسم جنۆکەکان بمکەن بەجادوگەر. بەڵام من حەزم نە لە جادوگەرەکانە نە لە بتەکان.

خاتوو خەدیجە زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:

-مەترسە ئەی موحەممەد! من لە دەموچاوتدا نوورێك دەبینم کە تا ئێستا نەمبینیوە.

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) وەك دووپاتکردنەوەیەکی قسەکانی خاتوو خەدیجە، وتی:

- ئەی خەدیجە، گوێم لە هەندێك دەنگە و جار جار ڕووناکی دەبینم. تا گەشتمە ئێرە هەر گوێم لە سەلام بوو. لەکاتێکدا چواردەورم جگە لە دار و بەرد هیچی تری لێنەبوو.

خاتوو خەدیجە کە بینی ترسەکەی سەروەرمان بەردەوامە ویستی دڵنەوایی بداتەوە و وتی:

- خوای گەورە هەرگیز شەرمەزارت ناکات. چونکە تۆ بە باشی هەڵسوکەوت لەگەڵ خزمەکانتدا دەکەیت، بەدەم بێچارەکانەوە دەڕۆیت، یارمەتی کەمدەرامەتەکان دەدەیت، دەستی زوڵم لێکراوەکان دەگریت، ڕێز لە میوان دەگریت و چاودێری ئەو کەسانە دەکەیت کە لە ڕێگای ڕاستدا توشی بەڵا بوون.

* * *



# تۆیت پێغەمبەری چاوەڕوانکراو

پاکی و جوانی ئاسمان و فراوانی بیابان و بێدەنگی حیرا دڵی پێغەمبەرمانی دەهێنایە جۆش و لە ناخیشیدا دەنگێك بەرەو ئەوێ پاڵی پێوە دەنا. دەستی بەسەر منداڵەکانیدا هێنا، کە بە "نووری چاوانم" بانگی دەکردن، پاشان ماچی کردن و کەوتە ڕێ.

خێزانەکەی، تا لە چاوان ون بوو، چاودێرییان کرد.

خاتوو خەدیجە، ڕۆژێکی ناخۆشی لە دووریی هاوسەرە خۆشەویستەکەی بەسەربرد. ئێوارە داهات و تاریکی ئاسۆی گرت. کاتێك ورد و درشتی گیانەوەرانیش بەرەو لانەکانیان گەڕانەوە، خاتوو خەدیجە دەرگاکانی داخست و دەستی کرد بە قسە و گاڵتە لەگەڵ منداڵەکانیدا. پاشان چووە سەر جێگەکەی، بەڵام هیچ خەو نەدەچووە چاوانی. تا ڕۆژ بووەوە لە ناو جێگەکەیدا هەر ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد.

هەر کە یەکەم تروسکایی ڕۆژ لەئاسۆی مەککەدا دەرکەوت، زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆ لە دەرگای ماڵ درا. هەموو یەکسەر بێدەنگ بوون و سەیری ڕوخساری یەکتریان کرد. یەکێکیان وتی:

- ئەوە بابەیە.

یەکێکی تریان وتی:

- بەڵێ، دڵنیام ئەوە.

کەس لەو باوەڕەدا نەبوو کە بابیان ئەمڕۆ بگەڕێتەوە. خاتوو خەدیجە لە جێگەی خۆی دەرپەڕی و بێ یەك دوو کردن، بگرە بێئەوەی بپرسێت "کێیە ئەوە؟" دەرگاکەی کردەوە. بە بینینی هاوسەرە شیرینەکەی، دڵی زۆر خۆش بوو. بەڵام ئەم جارەیان حاڵێکی زۆر جیاوازی تێدا بەدی دەکرا. خاتوو خەدیجە بۆ چەند ساتێك لە جێی خۆی سڕبوو. پێغەمبەری خوا هەڵدەلەرزی. هەر کە هاتە ژوورەوە وتی:

- دامپۆشن.

خاتوو خەدیجە زۆر بە هەستیاری و بە پەلە داواکارییەکەی جێبەجێ کرد و وتی:

- دایك و باوکم بە قوربانت بێت خۆشەویستم.

پێغەمبەر جارێکی تر وتیەوە:

- دامپۆشن.

خاتوو خەدیجە لای سەری هاوسەرەکەیەوە بە بێدەنگی چاوەڕێی دەکرد. پاش ڕەوانەوەی ترس و دڵەڕاوکێکەی پێغەمبەر، خاتوو خەدیجە لە هۆکاری ئەم حاڵەی مێردەکەی پرسی:

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێبێت) وتی:

- کاتێك لە ناو ئەشکەوتەکەدا بە پەرستشەوە سەرقاڵ بووم، لەناکاو ئەشکەوتەکە پڕ بوو لە نوور. مرۆڤێکی زۆر جوانم بینی کە جلوبەرگێکی زۆر جوانی لەبەردابوو و بۆنی خۆشی لێوە دەهات. پێی وتم "بخوێنە" منیش وتم "من خوێندەواریم نیە!" لەپاش ئەم وەڵامە لەباوەشی گرتم و توند گوشیمی، بە ڕادەیەك وامزانی دەمرم. دیسان وتم "خوێندەواریم نیە". ئەویش جارێکی تر لە باوەشی گرتم و توند گوشیمی و دیسان فەرمانی خوێندنەوەی پێکردم. منیش هەمان وەڵامم دایەوە. پاش ئەمە بۆ جاری سێیەم گوشیمی ئینجا بەری دام و وتی:

"ئەی محمد بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی درووست کردووە. مرۆڤی دروست کردووە لە پارچەیەك خوێن. بخوێنە پەروەردگاری تۆ (لە هەموو کەس) بەخشندەترە. ئەوەی کە مرۆڤی فێری نووسین کردووە بە قەڵەم. مرۆڤی شارەزا

کردووە بەو شتانەی کە نەیدەزانی.“ (العلق : ١-٥)

منیش قسەکانی ئەوم دووبارە کردەوە، پاشان دیار نەما.

خاتوو خەدیجە پاش ئەوەی بە دڵ گوێی لە پێغەمبەرمان ڕاگرت، وتی:

- مژدەت لێبێت! بەڵام ئاممان هەرگیز ئەو پلە و پایەیەت لە دەست مەدە. سوێند دەخۆم کە تۆ پێغەمبەری چاوەڕوانکراوی ئەم ئوممەتەیت. بەڵام بۆ زیاتر دڵنیایی دەچم لە وەرەقەی کوڕە مامم دەپرسم بزانم چی دەڵێت.

دەست بەجێ چووە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل. دانە دانە باسی ئەو شتانەی بۆ کرد کە بەسەر پێغەمبەرماندا هاتبوو. وەرەقە بە بیستنی ئەم وتانە زۆر خۆش حاڵ بوو و وتی:

- ئەو پێغەمبەرە. بڕۆ مژدەی پێبدە.

پاشان وتی کە دەیەوێت پێغەمبەرمان ببینێت، بۆیە لە بەردەم کەعبە بەیەك گەیشتن و وەرەقە وتی:

- ئەو شتانەی کە بینیوتە و بیستووتە دووبارە بۆم باسکەوە.

سەروەرمان لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە.

وەرەقە دوای ئەوەی گوێی لە قسەکانی گرت، ڕەنگی گۆڕا. ئەوەندە بە جۆش و خرۆش بوو، نەیدەتوانی لە جێی خۆی بوەستێت. کاتێك پێغەمبەرمان قسەی دەکرد هەردەیوت "سبحان الله، سبحان لله" لە کۆتاییدا وتی:

- ئەوەی هاتووە بۆلات جوبرەئیلە، فریشتەی سرووش. هەر هەمان ئەو فریشتەیەیە کە بۆلای موسا و عیسا هاتووە (سەلامی خوایان لەسەربێت). سوێند دەخۆم کە تۆ ئەو کۆتا پێغەمبەرەیت کە لە ئینجیلدا باس کراوە. پاشان بێدەنگ بوو.

خاتوو خەدیجە چاوەکانی دەبریسکانەوە و وەك مۆمێك پرشنگیان دەدایەوە. چی هەبوو لەوە گەورەتر کە ببێت بە خێزانی پێغەمبەرێك؟

وەرەقە بەچاوی پڕ فرمێسکەوە بەردەوام بوو لە قسەکانی:

- خۆزگە منیش گەنج بوومایە تا کاتێك گەلەکەت لەم ناوە دەرتدەکەن، لەگەڵت بوومایە.

ئەم وتانە خاتوو خەدیجەیان لە شوێنی خۆی سڕ کرد. پێغەمبەری خۆشەویستمان هەر توانی ئەوەندە بپرسێت:

- من لە مەککە دەردەکرێم؟

وەرەقە بە متمانە بەخۆبوونەوە وتی:

- بەڵێ، تۆ بەتاوانی درۆ تۆمەتبار دەکەن. ئازار و ئەشکەنجەت دەدەن و لە ماڵ و حاڵی خۆت دەرت دەکەن. لەمانە خراپتر، لەگەڵت دەجەنگێن. چونکە هەموو پێغەمبەرێك ڕووبەڕووی زوڵمی گەلەکەی بووەتەوە.

* * *



# جا کێ گوێ لە من دەگرێت!

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) کە فەرمانی "بخوێنە"ی پێکرابوو، زوو زوو دەچووە چیای نوور. هەموو ڕۆژێك لە ئەشکەوتی حیرادا چاوەڕێی جوبرەئیلی دەکرد. خاتوو خەدیجەش هێندەی پێغەمبەرمان ئارامی لێبڕابوو.

چەندین ڕۆژیان بە ئومێدی ئەوەوە بەسەر دەبرد کە مژدەیەکی تازەیان بۆ بێت. ئەمە چل ڕۆژی تەواوی خایاند. لە ئێوارەی چلەمین ڕۆژدا کاتێك پێغەمبەرمان لە چیای نوورەوە بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە، لە دۆڵەکەدا گوێی لە دەنگێك بوو. ئەم دەنگە ناسراو بوو، پێشتر چەند جارێك گوێبیستی بووبوو.

کە سەری بەرز کردەوە جوبرەئیلی بینی کە بە باڵەکانی باوەشی کردبوو بە ئاسۆدا. دیمەنێکی زۆر جوان بوو. فریشتەکە لەسەر کورسیەکی بێ وێنە لە نێوان ئاسمان و زەویدا دانیشتبوو. کە ئەم دیمەنە سەرسوڕهێنەرەی بینی هەستی بە قورسایی گەردوون کرد لەسەر شانەکانی. لە جێی خۆی لە هۆش چوو. کە هۆشی هاتەوە سەرخۆی بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوت.

لە ڕێگادا ڕووبەڕووی چەند شتێکی سەیر بوویەوە. چیا و بەرد و درەختەکان دەیانوت:

- سەلاموعەلەیك ئەی پێغەمبەری خوا.

وەك ئەوە وابوو هەموو گەردوون پیرۆزبایی لێبکات. کە گەڕایەوە ماڵەوە لە ژێر کاریگەری ئەو ڕووداوانەدا بوو قسەی بۆنەدەکرا.

خاتوو خەدیجە کە چاوەڕێی مژدەیەك بوو لە سەرووەرمان، بە بینینی ئەو لەم حاڵەتەدا ڕاچڵەکی. لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرمانەوە ئەمەی بیست:

- داپۆشن.

خاتوو خەدیجە زۆر جوان لاشەی پیرۆزی پێغەمبەرمانی داپۆشی.

پێغەمبەرمان پاڵی بە خاتوو خەدیجەوە دایەوە و ئەویش ئەژنۆی کرد بەسەرین بۆی. پێغەمبەرمان لە نێوان خەو و بە ئاگاییدا بوو. پاش کەمێك عەرەقەی شەونم ئاسا دڵۆپە دڵۆپە کەوتە خوارەوە. خاتوو خەدیجە لەوە دەترسا کە توشی نەخۆشیەك

بووبێت. پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) بەدەم وتنی: "الله اكبر"ەوە خەبەری بووەوە. خاتوو خەدیجە نەیدەزانی کە چی ڕوویداوە.

جوبرەئیل ئەم ئایەتانەی بۆ پێغەمبەرمان خوێندەوە:

"ئەی ئەو کەسەی کە خۆت پێچاوەتەوە. هەستە خەڵکی بێدار بکەرەوە. وە پەروەردگارت بە گەورە بگرە. وە پۆشاکت پاك ڕابگرە." (المدثر : ١-٤)

هەم پێغەمبەرمان و هەمیش خاتوو خەدیجە دەیانزانی کە ئەمە سرووشە. ئەم جارە پێغەمبەرمان وەك یەکەم جار کە سرووشی بۆ هات نەترسا. بەڵام قورسایی سرووشەکە لەسەر شانی بوو. سەری بەرز کردەوە و بە خاتوو خەدیجەی وت:

- خەدیجە، ئیتر وەستان نییە بۆ من. جوبرەئیل داوای لێکردم کە مرۆڤەکان ئاگادار بکەمەوە و بانگهێشتیان بکەم بۆ خواپەرستی. بەڵام ئاخر کێ گوێ لە من دەگرێت؟

خاتوو خەدیجە بێ دوودڵی وتی:

- من گوێت لێ دەگرم ئەی موحەممەد! من یەکەم کەس دەبم کە باوەڕ دەهێنم بەو شتانەی تۆ دەیڵێیت. پاشان هەردووکیان پێکەوە شایەتمانیان هێنا.

بەم شێوەیە خاتوو خەدیجە پلەی شەرەفی یەکەم موسوڵمانی پێ بەخشرا.

پاش ئەوەی سرووش دەستی کردەوە بە هاتن بۆی، زوو زوو سەردانی چیای نووری دەکرد. پێغەمبەرمان هەندێك ڕۆژ

درەنگ دەهاتەوە بۆماڵەوە. خاتوو خەدیجە هەندێك خواردن و شتی لەگەڵ خۆی دەبرد و دەکەوتە ڕێ بۆ لای. لە یەکێك لەم ڕۆژانەدا جوبرەئیل بە پێغەمبەری وت:

- ئەوە خەدیجەیە، بەرەو لای تۆ دێت. دەفرێکی پێیە خواردن و خواردنەوەی تێدایە. کە گەشتە ئێرە سەلامی خوای گەورە و منی پێبگەیەنە. هەروەها مزگێنی کۆشکێکی پێبدە لە بەهەشتدا.

کاتێك خاتوو خەدیجە گەیشت، پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) سەلامەکەی جوبرەئیلی پێڕاگەیاند. خاتوو خەدیجە وتی:

- بێگومان سەلامی خوای گەورەیە و سڵاو بێت لە جوبرەئیل. هەروەها سەلام و میهرەبانی خوای گەورە لەسەر تۆ بێت. جگە لە شەیتان سڵاو لە هەموو ئەو شتانەی گوێیان لێمانە.

* * *

# لەهەموو شتێکدا ئەو یەکەم کەس بوو

ئیتر سرووش بە ئاشکرا بۆ نێردراوی خوای گەورە دەهات. ڕۆژێك لە دۆڵێکی لای سەرووی مەککەوە جوبرەئیل گۆچانەکەی دا بە زەویدا و لە ژێر گۆچانەکەیەوە ئاو هەڵقوڵا. پێغەمبەری ئازیزیش بەسەرسامییەوە تەماشای دەکرد.

جوبرەئیل یەکەم جار لە ئاوەکە تا ئەنیشکی شۆرد و ئاوی لەدەم و لوتی وەردا. دەستی تەڕکرد و هێنای بە سەر و پشتی گوێیدا. لە کۆتاییدا تا قولەپێی قاچی شۆرد. پێغەمبەری خۆشەویستیشمان ئەو کردارانەی ئەوی دووبارە کردەوە. بەم شێوەیە یەکەم دەستنوێژی هەڵگرت.

پێغەمبەرمان پاش ئەوەی دەستنوێژی هەڵگرت، لەگەڵ جوبرەئیل بەیەکەوە دوو ڕکات نوێژیان کرد. ڕوخساری سەرووەرمان زەردەخەنەی تێکەوتبوو. ئەو پەرستشەی کە بە تاسەوە چاوەڕێیان دەکرد لەلایەن خوای گەورەوە دابەزی. بە دڵێکی پڕ باوەڕ و خۆشیەوە بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ. دەستبەجێ ئەو شتانەی بەسەریدا هاتبوو بۆ خاتوو خەدیجەی گێڕایەوە. پاشان بردیە لای ئاوێك و بەو شێوەیەی لە جوبرەئیلەوە فێربووبوو دەستنوێژی بە خاتوو خەدیجە هەڵگرت و بە یەکەوە نوێژیان کرد.

* * *

# قسەکردن لەگەڵ جوبرەئیل

خاتوو خەدیجە کەسێك بوو لە هەموو کەس زیاتر لە سەروەرمان تێدەگەیشت، تەنها سەرنج و شێوازی وەستانی سەروەرمان بەس بوو بۆ ئەوەی خاتوو خەدیجە لێی تێبگات. ئەو ڕۆژانەی کە خەمبار بوو، دڵنەوایی دەکرد و ئەو کاتانەی کە دڵخۆش بوو، هاوبەشی خۆشیەکەی دەکرد. کاتێك مرۆڤەکان پێغەمبەرمانیان بێزاردەکرد، ئەو لای خاتوو خەدیجە دەحەوایەوە.

لەو ڕۆژانەدا کە سرووش بە ئاشکرا بۆ پێغەمبەرمان دەهات، بێباوەڕان دەیانوت ئەوە فریشتە نیە بەڵکو شەیتانە کە بۆلای دێت. سەروەرمان لەم قسەیە دەترسا. ڕۆژێك کە پێغەمبەرمان گوێبیستی هەمان سوکایەتی پێکردن بوو بەخەمباریەوە گەڕایەوە

بۆ ماڵ و هەموو شتێکی بۆخاتوو خەدیجە گێڕایەوە. خاتوو خەدیجە دڵنیابوو لەوەی ئەوەی کە دێت جوبرەئیلە بۆیە وتی:

- ئەم جارە کە جوبرەئیل هات دەتوانیت پێم بڵێیت؟

پێغەمبەرمان (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی:

- بەڵێ.

خاتوو خەدیجە تایبەتمەندیەکانی جوبرەئیل لە زانای مەسیحی وەرەقەی کوڕی نەوفەلەوە فێربووبوو. ئەو دەیزانی کە جگە لە پێغەمبەر کەس جوبرەئیل نابینێت. لەبەر ئەم هۆیە بوو ئەم داوایەی لەسەروەرمان کرد.

کە جوبرەئیل هات، پێغەمبەرمان هەواڵی پێدا. خاتوو خەدیجە وتی:

- لەسەر ئەم ئەژنۆیەم دادەنیشی؟

کە داواکاریەکەی بەجێهێنا دیسان پرسی:

- ئێستاش دەیبینیت؟

وەڵامی "بەڵێ"ی وەرگرت پاشان داوای لێکرد کە لەسەر ئەژنۆکەی تری دانیشێت. کە سەروەرمان دانیشت دیسان هەمان پرسیاری لێکردەوە و هەمان وەڵامی وەرگرت. پاشان خاتوو خەدیجە هەندێك سەرپۆشەکەی لادا و پرسی:

- ئێستاش دەیبینیت؟

ئەم جارە وەڵامی سەروەرمان گۆڕا و وتی:

- نەخێر ئەی خەدیجە! ئیتر نایبینم.

خاتوو خەدیجە وتی:

- مژدەت لێبێت، دڵنیا بە ئەوە فریشتەیە و شەیتان نیە. چونکە هەستی شەرم کردن لای شەیتان نیە. ئەگەر شەیتان بوایە کە سەرپۆشەکەم لادا شەرمی نەدەکرد و ئێرەی بەجێ نەدەهێشت.

پێغەمبەری خۆشەویستیشمان جارێکی دیکە بەدڵنەواییەکەی ئەو ئاسودە بوو.

* * *

# پێشبڕکێی لەخۆبوردەیی

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) بەدرێژایی سێ ساڵ بەردەوام بوو لە بانگهێشتکردنی نهێنیی خەڵکی بۆ سەر ئاینی ئیسلام. لەم سەردەمەدا گەورەترین یاریدەدەری ئەو خاتوو خەدیجە بوو. خاتوونی مەزن بۆ ئەوەی ئیسلام بچێتە دڵی خەڵکیەوە لەخۆبوردەیی زۆری دەکرد. ئایینەکەمانی بۆ ژنان باس دەکرد و بە دەستی خۆی خوانی بۆ خەڵکی ئامادە دەکرد. بوو بە هۆکاری موسوڵمان بوونی زۆر کەس. لە ژنەکاندا خاتوو خەدیجە و لە پیاوەکاندا ئەبوبەکر هەروەك ئەوەی پێشبڕکێ لە لەخۆبوردەییدا ئەنجام بدەن، تا وای لێهات ئیسلام لەناو خەڵکی مەککەدا باس دەکرا.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ یەك یەك و دوو دوو ژمارەی موسوڵمانەكان زیادی دەكرد. لە كۆتایی ساڵی شەشەمدا ژمارەیان گەیشتە چل كەس. بە موسوڵمان بوونی عومەر كەس نەما لە مەككە ئاینی ئیسلامی نەبیستبێت. لە سووچێكەوە ئەبوبەكر و لە سووچێكی ترەوە زەید و لە لایەك عوسمان دەستیان كرد بە بانگهێشتكردنی خەڵك بۆسەر ئاینی ئیسلام.

بێباوەڕەكان كە ترسی ئەوەیان هەبوو هێزی موسوڵمانەكان زیاتر بێت دەستیان كرد بەئازاردانیان. تا دەهات ئازاردانەكانیان زیاتر دەكرد. ئەبوتاڵیب كە بینی بێباوەڕەكانی قوڕەیش چی دەكەن، پیاوانی عەشیرەتی بەنی هاشم و براكانی خۆی كۆكردەوە و ویستی پارێزگاریان لێبكات. ئەم دوو تیرە داواكاریەكەی ئەبوتاڵیبیان پەسەند كرد و چوونە لای.

بێباوەڕان كە ئەم هەواڵەیان بیست، دەست بەجێ كەوتنە خۆیان و ئەوانیش لەگەڵ یەك كۆبوونەوە و بڕیاریاندا كە موسوڵمانەكان داببڕن لە هەموو مافەكانی ژیان. ئەو خاڵانەی كە لە كۆبوونەوەكەدا لەسەری ڕێككەوتبوون لەسەر كاغەزێك نوسییان و بەدیواری كەعبەدا هەڵیانواسی. بڕیارەكان زۆر قورس بوون. پێغەمبەرمان كە ئەمەی بیست زۆر خەمبار بوو. بەم بڕیارەی بێباوەڕەكانی قوڕەیش ئەبوتاڵیبی مامی پێغەمبەریش هێندەی موسوڵمانەكان خەمباربوو. هەروەها ئەوەی بیری بێباوەڕەكان هێنایەوە كە ئەو نوسراوەی بە كەعبەدا هەڵیانواسیوە تەنها بەدبەختی و ناخۆشی لێدەكەوێتەوە. پێشنیاری ئەوەی كرد كە بەزەییان بەمرۆڤە بێتاوانەكاندا بێتەوە و گوێ لە كەسانی

گێرەشێوێن نەگرن و ڕەچاوی پەیوەندی خزمایەتی و دۆستایەتی بکەن و ئاشتی خوازبن.

بەدرێژایی سێ ساڵی ئەم دابڕینە بەردەوام چاودێری موسوڵمانەکانیان دەکرد. بێباوەڕەکان ڕێگای بازاڕ و دوکانەکانیان لە سەریان داخستبوو. ڕێگربوون لەوەی ئەو خواردن و خواردنەوانەی دەهاتە مەککە بگاتە ئەو شوێنانەی موسوڵمانەکانی لێ دەژیان. وە لە هەموو مافێکی ژیان بێ بەش کرابوون.

دەنگی گریانی منداڵە برسییەکان زۆر لەدوورەوە دەبیسترا. موسوڵمانەکان تەنها لە وەرزی حەجدا دەیانتوانی لەو شێوەی پەنایان بۆ بردبوو دەربچن و کەلوپەلی پێویست بکڕن. ئەو کاتەش ئەبو لەهەب بە بازرگانەکانی دەوت:

- ئەی بازرگانەکان، نرخێکی زۆر لە هاوڕێکانی موحەممەد داوابکەن و ڕێ مەدەن هیچ شتێکتان لێبکڕن.

هەموو کەس لە ئەبولەهەب دەترسا. کەس نەیدەوێرا لەقسەی دەربچێت. زۆر باش دەیانزانی ئەگەر بە قسەی نەکەن توشی چی دەبن. بۆیە بازرگانەکان نرخەکانیان چەند قات زیاد دەکرد و موسوڵمانەکان نەیاندەتوانی هیچ بۆ منداڵە چاو بە فرمێسکەکانیان بکڕن و بە دەستی بەتاڵ دەگەڕانەوەماڵەوە.

خاتوو خەدیجە بەدرێژایی دابڕینەکە هەموو سامانەکەی لە پێناوی موسوڵمانەکاندا خەرج کرد. کە هەموو شتێکی تەواو بوو، ئەویش وەك هەموان دەردی نەبوونی چەشت. کاتێك خزمەکانی ئەم هەواڵەیان بیست، بەنهێنی یارمەتیان دەدا. ڕۆژێك حاکمی برازای هەندێك گەنمی ئامادەکرد، تا بیگەیەنێتە دەستی خاتوو

خەدیجە. پێش ئەوەی بگاتە ئەو شیوەی موسوڵمانەکانی لێبوو ئەبوجەهل ڕێگای لێگرت و هاواری کرد:

- کەواتە تۆ خواردن بۆ نەوەکانی هاشم دەبەیت.

حاکم سەری لێشێوا. ئەبو جەهل هەم هاواری دەکرد هەم سەرزەنشتی دەکرد، زۆر توڕەبوو. حاکم ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. بێباوەڕەکان لە دەوریان کۆبوونەوە، لەوە دەترسا کە بیکوژن.

ئەبو جەهل وتی:

- تا من لێرە بم، نە دەتوانی بچیتە پێشەوە نە دەتوانی خواردن ببەیت! لە هەموو مەککەدا ڕیسوات دەکەم.

لەم کاتەدا هیشام هاتە لایان و ئەبوجەهل وتی:

- خواردن دەبات بۆنەوەکانی هاشم.

هیشام بەتوڕەییەوە وتی:

-تۆ چۆن ڕێگری لە کەسێك دەکەیت کە خواردن دەبات بۆ پووری خۆی.

پاشان بەڕەقی وتی:

- لەسەر ڕێگای ئەم پیاوە لاچۆ با بڕوات بۆ ئەو شوێنەی دەیەوێت.

ئەبوجەهل بەردەوام بوو لە کەللەڕەقی و مۆڵەتی نەدا بە حاکم و سەرەڕای ئەمەش هەر سەرزەنشتی دەکرد. بەڵام هیشام چیتر نەیتوانی لە بەرامبەر ئەو دیمەنەدا خۆی ڕابگرێت.

بۆیە بەدەوروبەری خۆیدا چاوی گێڕا و ئێسکی چەناکەی



حوشترێکی دۆزییەوە و بەتوندی کێشای بەسەر ئەبو جەهلدا. ئەو پیاوەی کە تا ماوەیەك لەمەو پێش خۆی تورە دەکرد ئێستا لەسەر زەوی دەتلایەوە. هیشام هێندەی لێدا وای لێهات نەیدەتوانی سەیری ئەوانە بکات کە لە چواردەوریان کۆبووبوونەوە.

لەکاتێکدا کە بێباوەڕان بەردەوام بوون لە ئازاردانی موسوڵمانەکان، ئەو ڕێکەوتننامەیەی بە دیواری کەعبەدا هەڵیانواسیبوو مۆرانە خواردی. لەناو ئەو ڕستەیەدا کە نوسرابوو "خودایە، بەناوی تۆوە دەست پێدەکەم" وشەی "خوا" هیچی

لێنەکرابوو. ئەمە سەرنجی هەموویانی ڕاکێشا و ئەبوتاڵیب لەمەوە توانای دایە بەرخۆی و هاواری کرد:

- هێشتا هەستتان بە زوڵم و خراپەکاریەکانتان نەکردووە؟

لەدوای ئەم ڕووداوە بە یارمەتی هەندێك بێباوەڕی بەبەزەیی کۆتاییان بەدابڕینەکە هێنا.

بەدرێژایی ئەم دابڕینە سێ ساڵییە، خاتوو خەدیجە کە بەدەوڵەمەندی ناوبانگی دەرکردبوو، هەرچیەکی هەبوو لە پێناوی موسوڵمانەکاندا بەخشی، تا کار گەیشتە ئەوەی ئەم مرۆڤە دەوڵەمەند و خانەدانە ئاتاجی تەنها فەردەیەك گەنم بوو. خزم و نزیکەکانی بەم حاڵەی زۆر خەمباردەبوون. بەڵام بەلای ئەوەوە هیچ شێك لەوە خۆشتر نەبوو کە لای پێغەمبەرمان بمێنێتەوە و هاوکاری بکات.

* * *

# ساڵی ماتەمینی

ساڵەکانی دابڕین زۆر ئازاری خاتوو خەدیجەیان دا. بەهۆی نەخۆشیەکانیەوە زۆر لاوازبوو، تا لەجێگەدا خستی. ئیتر دەستەویەخە بوو لەگەڵ نەخۆشیەکان. پێغەمبەری خۆشەویستمان زۆر خەمی دەخوارد. کەس ئەوی پێشتر بەم خەمبارییەوە نەبینیبوو. فرمێسکەکانی دڵۆپ بە دڵۆپ بە ڕوومەتی پیرۆزیدا دەهاتنە خوارەوە. وشەکان لە قوڕگیدا دەگیران.

پێغەمبەرمان بە هێواشی لێی نزیك بووەوە و وتی:

- ئەی خەدیجە، بەهۆی منەوە تووشی زۆر ناخۆشی بوویت.

خاتوو خەدیجە توانای قسەکردنی نەبوو، بە چاوەکانی وەڵامی دایەوە وەك ئەوەی بڵێت:

-نەخێر...نەخێر.

پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر بێت) وتی:

- بە شێوەیەك لای من نەژیایت کە شایانی تۆ بێت. وا نەژیایت ئەی خەدیجە! بەڵام ئەوەی جارێك بسووتێت جارێکی تر ناسووتێت. خوای گەورە پاش ئەو نارەحەتی و ناخۆشیانە پەیمانی خێری داوە.

بەشەو و ڕۆژ لای سەری خاتوو خەدیجە دەمایەوە. قورئانی دەخوێند و دوعای بۆ دەکرد. وادەی کۆچی نزیك بووبوویەوە تا ئەوەبوو لە بیست و حەوتەمین ڕۆژی ڕەمەزاندا. ئەو هاوسەرە بەوەفایە، دایکی دایکان خاتوو خەدیجە وەك باڵندەیەك بەرەو بەهەشت هەڵفڕی.

تەمەنی شەست و پێنج ساڵان بوو. بیست و پێنج ساڵی تەواوی لەگەڵ پێغەمبەرمان بەسەربرد. خەمی ئەو ساتەی سەروەرمان هێندە گەورە بوو باس ناکرێت، لەبەر ئەوەی ڕاستگۆترین هاوەڵی لەدەست دا. ئیتر لەو کاتە بەدواوە پێغەمبەرمان خۆی بۆ کۆتا ئەرکی ئامادە کرد. تەرمی پیرۆزی خاتوو خەدیجە بەرەو گۆڕستانی حاجوون لەمەککە بەرێکرا. سەروەریشمان نوێژی جەنازەی لەسەر کرد و ئەسپەردە کرا.

ئەبوتاڵیبیش کە پاڵپشتی سەرەکی و یارمەتیدەر و پارێزەری پێغەمبەرمان بوو لە بێباوەڕان لەساڵەکانی دابڕیندا هەرچیی

هەبوو، لە پێناوی موسوڵمانەکاندا خەرجی کرد و لەخۆبوردەییەکی بێوێنەی نواند. ئەبوتاڵیب هەموو کات یارمەتیدەرێکی باش و هاوڕێیەکی ڕاستگۆبوو. دوای سێ ڕۆژ لە کۆچی دوایی خاتوو خەدیجە ئەویش کۆچی دوایی کرد. پێغەمبەرمان لە ماوەی سێ ڕۆژدا دوو کەسی زۆر خۆشەویست و پشت و پەنای خۆی لەدەست دا. دوای ئەم وەفاتە یەك لەدوای یەکانە پێغەمبەرمان وتی:

- نازانم بۆکام لەم دوو کۆستەی ئوممەتەکەم خەم بخۆم، ئەوە بوو ناوی ئەم ساڵە نرا "ساڵی ماتەمینی".

* * *

# حەزرەتی

# خەدیجە

**ڕەزای خوای لێبێت**

هاوەڵی ژیان و نهێنی پارێز و گوڵە بێوێنەکەی سوڵتانی گوڵان (دروودی خوای لێبێت)...
دایکی دایکان حەزرەتی خەدیجە...
هێندە مەزنە کە لە دووتوێی ئەم پەرتووکە بچووکەدا جێی نابێتەوە...
کەسایەتییەکی پێشەنگی نموونەیی کە وشە لە پەسنیدا دەستەوسانە...
یەکەمین هاوکار، یەکەمین باوەڕدار، یەکەمین موسوڵمان...
ئەو مرۆڤە بەختەوەرە بوو کە شەرەفمەندی ٢٥ ساڵ هاوسەرێتیی سەروەرمان بوو...
ژیانی ئەو زەریایەکە...

بەسەرهاتەکانی نێو ئەم پەرتووکە تەنها دڵۆپێکن لەو زەریایە...
بەهیوای سوودمەندبوون و تێگەیشتنمان لەم زەریایە و گەشتنمان بە شەپۆلەکانی، لەم دڵۆپەوە بەڕێ دەکەوین...

9 649750 000314
Gül Devri-6 Hz. Hatice

İRFAN
PUBLISHING

نرخی ٣٠٠٠ دینارە